ئـەمینداریتی گشتی ڕۆشـنبیری و لاوانی ناوچـەی
ئۆتۆنۆمی - بەڕێوەبەریتی ڕۆشنبیری یارمەتی لە چاپدانیداوە

# پەندی پێشینانی کورد



لە کۆکردنەوەو ڕیزکردنو لە سەر نوسینی
عەلی معروف شارەزووری

بەرگی یەکەم

چاپی یەکەم

چاپخانەی. الحوادث.
بەغدا - ١٩٨١

## پێشکەشە : ـ

بەگیانی پاکی ئەو باو باپیرو داو داپیرە مامۆستایانەی کەتێمەیـان لەبیرنەچووەو ئەم پەندو ئامۆژگاری یە بەکەڵکانەیان بەکەلەبوور بۆ بەجێ هێشتوین ، بۆڕووناك کردنەوەی ڕێگای تاریکی ژیانو بژێوی مێشكو دڵو دەرونمان •

وەبەو بیرو هۆشە فراوانو هەستو دەروونە ووریاو ، ئارەزوە خاوێنانەی کەئەم مۆچیاریە مێژوویی‌و بەنرخانەیان کردویـن کەتاگەلی کورد مابێ ڕۆڵەکانی شانازی پێوە ئەکەن •

# پەندی پێشینانمان

سەرەتایەکی کورت :ـ

لەپاش خوێندنەوەی چاپی یەکەمو دووەمی ئەو پەندانەی کەمامۆستا ( شێخ محمدی خاڵ ) کۆی کردبوونەوەو پەندی‌کوردی کەمامۆستا ( عمر شیخ الله دەشتەکی ) کۆی کردبوونەوە ، بۆم دەر کەوت کەپەندی تری زۆرمان هەیەو تیایاندا نەنوسراون وگەلەکەمانی پێ‌دەوڵەمەندە ؛ بۆیە بەئەرکێکی سەرشانی خۆمم زانی‌و دەستم کرد بە کۆکردنەوەو لەسەر نووسینی ئەوپەندە کەمانەی کەئەمزانین وتائێستە بڵاو نەکراونەتـەوە ، بەو هیوایەی کەبتوانم لەم ڕووەوە ڕاژەیـەك پێشـکەش بەبرایانی کورد زمانم‌بکەم •

هەرچەند کەمن لەئیشی فۆلکلۆریشدا تواناو پایەو پلەیەکم نیە ، بەڵام لەبەر ئەوەی کەئەم هونەرەم بەگرنگ زانی‌و یەکێکم لەم گەلە ؛ بۆیە بەپێویستم زانی کەچی لەدەسەڵات‌و توانامـدا هەبێ هـەوڵ بدەم‌و کۆشش بکەم بۆکۆ کردنەوەو لێـکدانەوەی ئەوژمارە پـەندە کەمانەی کەئەمزانین ، ساپشت بەخوا بەڵکو جارێکی تر بتوانین شتێك لەم‌بارەیەوە بنووسین ! •

لەم ڕووەوە هەموو گرنگی‌و گەورەیی‌یەك هەر بۆمامۆستایانی ئـەم بابەتە ، بەتایبەتی شیخ محمدی خاڵ ئەگەڕێتەوە ؛ چونکە توانیویەتـی

بەرهەمی خۆی‌و شۆڕەسوارانی ئەم مەیدانە مامۆستایان ( اسماعیل حقی شاوەیس ) و ( مەعروف جیاوك ) لەبەرگێکدا چاپ بکات‌و ژمارەیـــان نزیکەی چوار هەزار بەندێکە ، وەبەڕێز مامۆستا (عمر شیخ الله دەشنەکی) کەنزیکەی هەزار پەندێکی بلاوکردۆتەوە •

لێرەدا ئەوەندە هەیە کەمن هەوڵی ئەوە ئەدەم ئاشکرای بکەم کەوا کەلەپووری گەلەکەمان بێ‌ئەوەی دەریایەکی ئەوەندە قووڵ‌و بێ‌پایانە کەهەر کەسێك پیەوێ مەلەوانی تیابکاو مەلەوانێکی زۆرباش‌و لێ‌هاتوو نەبێ، لەپاش ماوەیەك ئەبینین دەست‌و پێی شل‌و مانوو ئەبێ‌و لەجێگایەك ڕائەوەستێ بتوانێ بپەڕێتـــەوە ئەوبـــەری ، هـــەروەك من‌و ئێـــستاو بـــگرە هی‌تریش بەسەری‌بێ ، یان بەسەری هاتبێ ؟ هۆی ئەمەش ئەوەیە کەئەم جۆرە هونەرەئیشی تەنیا کەسی نیەو پێویستی بەیارمەتی هەموانە لەهەموو رووبەکی زانستی‌یەوە •

هەموو گەلێك لەگەلانی ئەم سەر زەمینە بەمێژوو وهونەرو خەباتـــی ڕۆڵەکانیەوە ئەناسرێتەوە ، وە لەبەر ئەوەی کەگەلی کوردمان هیچ کەم‌و کۆڕیەکی لەم ڕووەوە نیەو خاوەنی مێژوو زمان‌و هونەرو هەموو مەرجـــە میللیەکانی خۆیەتی‌و بەهۆیانەوە توانیویـــەتی خـــۆی لەژێـــر زەبرو زۆرو ستەمکاری ڕۆژگاردا ڕابگرێ ؟ بۆیە لەسەر ڕۆڵەکانی پێویستە زیاتر هەوڵ‌و تەقەلا بدەن بۆزیندو کردنەوەو پەرەپێدانی ئەم هونەرانەو هەموو دیاردە میللیەکانی ترو پێشخستن‌و تەنانەت گۆڕینیشیان بۆ زمانی بێگانە ئەگەر تواناهەیێ‌و بخرێتەکار !

هەرپەندە لەپەندی پێشینانمان ، یان زوربەی زۆریان، شایستەی ئەوەن کەکتێبێکیان لەسەر بنوسرێت ، یان چیرۆکێکی تەمسیلی وەیـــان شانۆیی بۆ سازبکرێ ، ئەگەر فلیمێکی سینەماییش نەبێ •

## پەندی پێشینانمان : ـ

# پێشەکی

پەندی پێشینانمان وتەیەکی کورت ، یان نیمچە درێژە کەبەهۆیەکەوە وترابێ‌و دەست نیشان کەرو ڕێ‌نیشان‌دەربێ بۆ مەبەستێکی دیاری کراو ، کۆمەڵ خاوەنیەتی‌و لەژیانی کۆمەڵ ئەدوێ •

پەندی پێشینانمان ، کۆمەڵە وتارو ئامۆژگاری‌یەکی کاریکەرو ڕێك‌و پێك‌و پرشنگدارو بەنرخە ، لەباو باپیران‌و داوداپیرانمانەوە کە پێش چەندەها ساڵ لەمەو پێش وتویانەو بەکەلەپوور بۆمان بەجێ‌ماوەو ئەمێنێ ، وەك بەڵگەو ڕێ‌نیشاندەرێك لەژیانی ڕۆژانەو کردارو وتارماندا بەکاریان ئەهێنین‌و کەڵکیان لێ‌وەر ئەگرین •

پەندی پێشینانمان ، زمانی ڕەش‌و ڕووت‌و چەوساوەو ڕەنجکێشی گەلەکەمانەو کۆمەڵە ئامۆژگاریەکی وێژەیی‌و گەنجینەیەکی هەمیشەیی‌و بەکەڵکە ، کەوەك ئاوێنەیەکی باڵاڕوان‌و پاك‌و بێ گەرد ، کەهەمیشە وهەتا هەتایە ڕۆڵەکانی گەلەکەمان وێنەی ژیان‌و جۆروباری مێژوویی باوباپیرانی تیائەبیننەوە ؟ بۆئەوەی بەهۆیانەوە بزانن‌و تێ‌بگەن کەئەو باپیرانەمان چۆن توانیویانە لەو جۆرەها باری ناهەموارو ستەمکارو ژێر

چەپۆکە سەری‌دا ، وەك چیاکانی ولاتەکەمان خۆیان چەسپاندوەو هیــچ کاتێك بەفرو بارانو ڕەشەباو کڕێوە ، نەیان توانیوەو ناتوانن ئەزنەکیــان پێ بدەن .

پەندی پێشینانمان ، وەك دەستورو باوێکن کە ڕابوردمان لەسەری ڕۆیشتوونو ئەبێ ئێمەش لەبەرتینو ڕووناکی‌یان خۆمان گەرم بکەینەوەو دانیشمینو بەفێنکی‌و سازگاری‌یان بحەسێینەوەو بەزمان ئاوازیان بدوێینو گۆرانی بلێین .

خوێنــەری بەرێز ، ئــەزانین هەمــوو گەلێــك لەگەلانی ئــــەم جیهانە (لەوانەش گەلی کوردمان) بەچەند ڕۆلێکدا تێپەڕیــون ، وەك کۆیلەگەرێتی‌و بەندایەتی ( الرق والعبودیة ) وە دەرەبە گایەتی‌و پاشایەتی کەلە هەریەکە لەم دەورانەدا جۆرە چەوسانەوەیەکی ستەمکاری کراوە، جۆرەگورزو کوتەکێکی کوشندە ، شلپەی دڵ تەزێنی خۆی هەڵساندوە؛ بۆیە لەپەندەکانا ، هەریەکە تارادەیەك دروشمو مۆری خۆی پێـــوە دیارە ! وەبــۆ ئــەوەی بزانــرێ کەپەندەکان لەچ کاتێــك لەورۆلانەدا وتراون ولەبەرچی‌و مەبەس چی‌بووە ، بێ‌گومان ئەم کارەش پێویستی بەقوتابخانــەو زانستکار مامۆستاو پسپۆری تایبەت بەم بابەتــەی هــەیە ؛ بۆگەڕان بەشوێن ئەم بابەتە بەکەڵکە دابۆ باس‌و دیراسەو لێکۆڵینەوەی .

هەرچۆنێك بێت ، من لێرەدا ناتوانم باسی ئەوخزمەتە گەورەیە بکەم، کەپێشینانمان پێشکەشیان کردوین ، تەنها ئەوەنەبێ ، کەهەرچی بلێــم هەرکەمەو زیاتر شایستەی ڕێزو سوپاسنو ئێمە قەرزاریانین ؛ چونــکە بەردی بناغەی ئەدەبو ڕۆشنبیری‌و زانســتی گەلەکەمانیــان لەهەمــوو ڕوویەکی کۆمەلایەتی‌و ئابووری وڕامیاری‌یەوە ... داناوەوە پەندەکان بوونەتە بەشێکی گەورە لەکەلەپووری میللیمانو لەئەنجامی تاقی‌کردنەوەیەکی سەختو دوورو درێژی ژیانی پڕ لە ناخۆشی‌و ڕەش‌و ڕووتی‌و برسێتی

چینەکانی گەلەکەمانا تێپەڕیون‌و هاتوونەتەبوون‌و تێکەڵاوی ژیانی پڕلە ناسۆری دەستی چینە چەوسێنەرەکانە؛ بۆیە سەردەمی پەیدابوونیان ئەگەڕێتەوە بۆکاتی پەیدابوونی ئادەمیزادی کورد خۆی‌و لێی جیانابنەوە •

پەندی پێشینانمان ، تێکەڵاوی خوێن‌و گۆشت‌و تێ‌هەڵکێشی ئێسقان‌و دەماری ئادەمیزادی کوردن‌و هەمیشە لەزاوزێدان •

پەندی پێشینانمان بەشێکە لەفۆلکلۆری میللیمان کەئەمانەن : پەندی ، گۆرانی ، مەتەڵ ، گاڵتەو گەپ ، چیرۆك ، شیعر ، داستان ، ئەفسانە ؛ یاری ، مۆسیقا ، وەهەموو نەریتێکی تری کۆمەڵایەتی کەبۆمان بەجێ‌مابێ وەك : نەریتی ژن‌هێنان‌و جل‌وبەرگ‌و دەواودەرمانی میللی ••• تاد هیواداریِن ڕۆژێك بێت کە لەهەموو پارچەو ناوچەیەکی کوردستانە وە چاکی مەردایەتی لێ‌بکرێ بەلادا بۆ کۆکردنەوەی فۆلکلۆرێکی یەك گرتووی کوردیی ڕەسەن •

زوربەی پەندەکانمان ، بەتایبەتی کۆمەلایەتیەکانیان ، لەئەنجامی برسێتی‌و نامەزرۆیی ژیان وتراون ، وەك : نان‌و ئیمان ، نان ناچێتە سەرە ڕێگا ، بەڕوویەك بۆ برسی‌یەك قەڵایەکە ، ئەگەر ئەتەوێ بەهەشت بپۆشی نەفسێ تێرئەکەی سرێ ئەپۆشی •

وەلەبەر ئەوەی کە ئافرەت لەدوولاوە چەوسابۆوە ، یەکەم لەلایەن زۆرو ستەمکارانی کۆمەڵەوە ، وەکو مرۆڤێك ، دووەم لەلایە پیاوەوە ؛ بۆیە زۆر لەپەندەکان ، بەتایبەتی کۆمەڵایەتیەکانیان ، یان ئافرەت ووتوونی ، یان بەسەر ئەوانا چەسپێنراوەو مل‌هوڕی بەرامبەریان کراوە وەك : ـ

شەلەباوان ، کوێرە باوان (١) • بخۆ خۆڵەکەوی ، شوومەکە سەر بەهەوێ •

---

(١) پەندی پێشینان ، شیخ محمدی خاڵ •

خۆی بۆخۆمو کچی بۆکوڕم ، هەرکەس قسەبکا سکی ئەدڕم !!؟

وەیان لەبارەی بەختو ناوچاوانەوە ئەدوون وەك :ـ

پیاو بەختی باش‌بێ ، سەگیشی خێرا ئەبێ •

ئەگەر ئەمزانی بەختم خاسەبوو نیشانەی چەیـم لەلای راسەبوو •

وەهەندێکیشیان کێش‌و سەروا دارن وەك :ـ

یەك‌وبڕ ، قۆدی‌پڕ (٢) •

کاتێك ئەزانی فەسڵ خۆشەبێ

دار گەڵا ئەکا ، (بەمۆ) ڕەش ئەبێ (٣) •

وەهەندێکی تریشیان لەشێوەی گلەیی‌و بناشتدان وەك :ـ بەشێکم ئەوێ سەرۆ نراو بێ بەشێکم ناوێ بەزۆر سنراوبێ وەهەندێکی تریشیان لەشێوەی پرسیارو وەڵامدان وەك :ـ تەون کێ‌کردی ؟ ئەووەی‌بری • یان تەنها پرسیارن وەك : داری قنگر چۆنە ؟ ، ئاش هەڵگەڕێتەوە ، مزەی ئەدەی ؟ •

چەند تێبینی‌یەك :ـ

١ ـ ئەم پەندانە هەموویان هی‌پێشینان نین ، بەڵکو هی‌ئەم سەردەمەشیان تیایە ؛ چونکە ئادەمـیزادی ئـەم سەردەمە پێشینانـی دوارۆژن ، وەئەگەر ئێستە نەیان نووسین ، لەوانەیە دوایی هەندێکیان لەبیر بچنەوە

---

(٢) قۆدی : قوتوو •

(٣) بەمۆ : چایەکە لای دەربەنی‌خان •

٢ ـ ئەو پەندانەی کە تائێستە بڵاوکراونەتەوە ، بەم پەندانەشەوە ، پێویستیان بەلێکۆڵینەوەو دەستبژار کردنێك هەیە ؛ چونکە زۆر بێو بۆر بێ ، یان : زۆریو زلۆری ، نابێ •

٣ ـ زوربەی زۆری ئەم پەندانە هیناوچەی شارەزورن ، بۆیە هەر بەهەمان شێوە نوسیومن ، وەك بەکارهێنانی پێتی (و) لەباتی پیتی (ب) وەك لەپەندی : خۆ پێت نیە وەخەنەوە لەباتی : خۆ پێت نیە بەخەنەوەدا ئەبینرێ ••• تاد •

٤ ـ هەندێ جاریش لەهەندێ وشەدا پیتی ( هەمزە )م بەکار نەهێناوە ؛ چونکە ئەمپیتە زۆرجار لەقسەکردنا ، نادرکێنرێ وەك : لەباتی چاك ئەبوو ، نوسیومە : چاکەبوو ••• تاد •

٥ ـ لەوانەیە هەندێك لەمپەندانە لەرشتەی مرواری مامۆستا ( علاءالدین سجادی )شدا بڵاوکرابێتەوە ! هۆی ئەمەش ئەوەیە کەواهەرچەن هەوڵمدا سێ‌لەبەرگەکانی ئەو کتێبەم دەستنەکەوت ، تا ئەوەی لەوێ هەیە دەستێشانی بۆبکەم ، یان بیانسڕمەوە ، هەر چەنــد فۆلکلۆری کوردی بەتایبەتی پەندەکانمان وەك تامو خۆی وان بۆ چێشتو خواردەمەنی ، واتە بۆهەموو بابەتو دوانێك ئەگونجێن کەناویان بەرین •

٦ ـ لەوانەشە کەچەند پەندێکی کەمیش لەمپەندانە لەهی مامۆستا شێخ محمدی فاڵیشدا هەبێت ! هۆی ئەمەش ئەوەیەکە : ئێستە ئەوکتێبە بەنرخە لەبازاڕو کتێبخانەکانیشدا دەست ناکەوێ ! وەمنیش بەهۆی بەڕێز مامۆستا عمر شێخەڵلاوە، کەزۆر زۆر سوپاسی ئەکەم،

توانیم دانەیەکم دەست کەوێ ، بەڵام بۆماوەیەکی کەمنەبێ ، نەتوانرا لامبمێنێتەوە ، داوای لێبوردن ئەکەم •

٧ ـ لەکۆتاییدا ئەوەی ئەمەوێ بیڵێم ئەوەیە کەهەندێك لەم پەندانە هێجگار بێبەرگ‌و کاڵاو ڕووت‌و قووتن وەزۆریش بیرم ئەکردەوە کەئەوجۆرەیان نەنوسم ، بەڵام لەترسی لەبیر چوونەوە ، پێم‌نا بەجەرگی خۆماو نووسیمن داوای لێبودن ئەکەم •

عەلی شارەزووری
شاری هەولێر
ئەیلوولی ١٩٨٠

## بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

## پیتی هەمزە ـ ئەلف ـ

١ ـ ئاخری پیری ، ماجەرا دیری •
٢ ـ ئادار مەشکە لەدار ، لێرەش‌نە ، لەژەنگار •
٣ ـ ئادار نەبێ خەتاکار ، خەلە دێنێ جنگ‌و بار •
٤ ـ ئاری ساج‌کەرێم ، بێ‌بە ماج‌کەرێم ! •
٥ ـ ئاسمان بەرزو زەوی سەختە ، لەدەرماڵتا ئەبمە تەختە !•

---

١ ـ یەکێك ئەیڵێ ، کەلەکاتی پیری‌دا شتی سەیرتر بینێ •
٢ ـ واتە لەمانگی ئادارا ئاژەڵ ئەدۆشرێ‌و مەشکە ئەژەنرێ •
٣ ـ واتە لەومانگەدا بارانەبڕان ، یان کەم بارانی نەبێ ، هەرچنگە تۆوێك بارێ بڕیاری ئەبێ •
٤ ـ گەورەکچێك لەکاتی نان‌کردنا بەکوڕێکی منالی خزمی خۆی ئەڵێ بەوهیوایەی کەبیخوازێ •
٥ ـ کوڕێك بەباوکی کچێکی ئەڵێ لەکاتی خوازبێنی کچەکەیدا، واتە مردووم‌و کفنم‌بکە ! •

٦ ـ ئاسمان بەچاتۆڵ ئەزانی (١)

٧ ـ ئاش هەڵگەڕێتەوە ، مزەی ئەدەی ؟ (٢)

٨ ـ ئاغا ژنیش پێویستی بەشوژن هەرئەبێ (٣)

٩ ـ ئاگر گۆشت نەبرژێنێ ! (٤)

١٠ـ ئاو وئار ، هارو مار ، ئامانیان نیە (٥)

١١ـ ئاو ئەیبا ، دەست بەکەفەوە ئەگرێ (٦)

١٢ـ ئاوریشم نابێتە پۆی دەوار (٧)

---

(١) چاتۆڵ : دەوار (ڕەشماڵ)ی هاوینەیە ، کەلەهی زستانە بچوکترە، بەیەکێك ئەوترێ کەفیزی زلو دەماری گەورەبێ •

(٢) واتە ئەگەر ئەوکارەم ئەنجام هێنا ، هەقەکەیم ئەدەیتێ ؟•

(٣) مەردم کاری هەر ئەکەوێتە یەکتری ، بەرەوڵە مەنیو هەژاری نیـە •

(٤) بەیەکێکی هیچو پووچی ئەڵێت ، کەهەڕەشەیەکت لێبکا •

(٥) واتە خۆتیان لێبپارێزە •

(٦) بەیەکێك ئەوترێ، کەکەوتبێتە تەنگو چەڵەمەیەکی مەترسیدارەوەو پەنا بباتە بەر چەن کەسێکی لاوازو هیچلەبارا نەبوو بۆرزگارکردنی•

(٧) دووکەس ، یان دووشتی لەیەك نەچـوو ، هەرگیز نایان کرێو ناگونجێن • وەك پیرەمێر ئەڵێ : ـ

مەیمون چۆن ئەبێ بەوەستای دارتاش

بلبلو لەقلەق چۆن ئەبنە وولاش ؟

١٣- ئاو لەرێی کەعبەدا دراوە (٨)

١٤- ئاو هات ، ئاو ماڵکە خۆتلادە (٩)

١٥- ئاهێکی نەگرفتەیە (١٠)

١٦- ئەگەر ئەمزانی بەختم خاسەبوو نیشانەی چەپم لەلای ڕاسەبووو(١١)

١٧- ئەگەر باوك دەهۆڵ چی بێ ، مناڵەکانیشی هەڵپەڕکێ کەرئەبن (١٢)

١٨- ئەگەر چێر بەدۆ دەبوو لەدەرکەی ماڵی خاوەنی دەبوو (١٣)

١٩- ئەگەر عاقڵی گوڵێکت بەسە ئەگەر بێعەقڵی بنباری بەسە (١٤)

---

(٨) بەیەکێکی ئەڵێت ، کەداوای شتێکی لێبکەیو نەتداتێ ، بەتایبەتی ئاو ، واتە بمدەرێ خێرت ئەگاتێ •

(٩) ئاوماڵکە : ئەوچیلکەو دارو پووشو پلاشەیە ، کەئاوی زۆر ، یان لافاو ڕاماڵی ئەکاتەو کۆی ئەکاتەوە ، وەکەئاوی زۆرهات ، ئەیباتەوە، واتە ئەبێ کەم مل کەچی زۆربێ لەگەڵڕێزگرتنی کەمەکەشدا •

(١٠) بەشتێك ئەووترێ ، کەزۆر درەنگ بێتەدی ، یان هەر نەیە نەدی •

(١١) گوایا ئەوانەی نیشانەیان لەلای ڕاستیانەوەیە ، بەختو ناوچاوانیان باشترە لەوانەی کەلەلای چەپیانەوەیــە ؟ پێویستی بەتاقـی کردنەوە هەیە •

(١٢) واتە باوك هەرپیشە وڕەوشتێکی هەبێ، مناڵەکانیشی وائەبن ؟ بۆیە پێویستە باوكو دایك مناڵی خۆیان لەسەر پیشەوخووو ڕەوشتی بەرز گەورەبکەن •

(١٣) چێر : مانگا • واتە شتی باشو بەکەڵك لەناو نابرێ •

(١٤) گوڵ ، بۆ بۆن کردنو جوانیە ، زۆرهەڵگرتنی بێزێریی ئەگەیەنێ •

٢٠- ئەگەر بتەوێ بەهەشت بنۆشی نەفسێ تێر ئەکەی سڕێ ئەبۆشی(١٥)
٢١- ئەگەر نازانی هەوار بگری ، بڕۆ هەوارەکۆنەی دەوڵەمەنێك (١٦)
٢٢- ئەڵێی بەزەردەی بەڕوو کەوتووە (١٧)
٢٣- ئەڵێی بەزەردی وەلی کەوتووە
٢٤- ئەڵێی بە ( ک٠٠ )ی کوێرا ئەڕوانێ (١٨)
٢٥- ئەڵێی پیازی سەرچاویەتی (١٩)
٢٦- ئەڵێی ترشی قیمەت ناکا (٢٠)
٢٧- ئەڵێی چێشتی مجەورە (٢١)
٢٨- ئەڵێی حەبی قووت داوە (٢٢)

---

(١٥) واتە ئەگەر دەستی یارمەتی درێژکەی بۆبرسیو هەژارو لێقەوماو وەکارت بەسەر ئیشی پەنهانی خەڵکیەوە نەبوو ، ئەوکاتە خواش لێت خۆشەبێ ٠

(١٦) مەبەس لەدەوڵەمەن ، پیاوی زاناو ڕۆشنبیرو دنیا دیدەیە کەپێویستە چاویان لێبکرێ بۆنێربوونی خووو ڕەوشتی بەرز ٠

(١٧) بەیەکێکی زەردەڵەو لاواز ئەووترێ فێر ٠

(١٨) بەیەکێك ئەوتری، کەزۆر مژمۆڵەو داماوبێو نەزانێ سەرو بنو خوارو ژووری کارێ لەکوێیەو دوش دامابێ بەدیاری‌یەوە ٠

(١٩) واتە زۆر ڕقی لێبەتی ٠

(٢٠) بەیەکێکی ڕووگرژو داماو ئەووترێ ٠

(٢١) مجەور : خادمی مزگەوت ، کەجاران هەموو چێشتەکانی ئەکردە قاپ ، یان دەفرێکەوە ، بەشتێك ئەوترێ ، کە لەزۆر شتی هەمە ڕەنگ‌و تێکەڵو پێکەڵ پێکهاتبێ ٠

(٢٢) بەیەکێك ئەوترێ ، کەخاوو خلیچك‌و گێژو وێژبێ ٠

٢٩ـ ئەڵێی خۆڵو دۆ کراوە بەسەریا (٢٣)

٣٠ـ ئەڵێی داڵی دیار لاپووره (٢٤)

٣١ـ ئەڵێی دەرزیی قووت داوە (٢٥)

٣٢ـ ئەڵێی دێوی ئاگرە سەرچووە (٢٦)

٣٣ـ ئەڵێی سەی ناوگەنمە (٢٧)

٣٤ـ ئەڵێی قاوت کراوەتە دەمی (٢٨)

٣٥ـ ئەڵێی قورئانی ناحەقی خواردوە (٢٩)

٣٦ـ ئەڵێی کەر ئەکا بەئاشا (٣٠)

---

(٢٣) بەیەکێك ئەوترێ ، کەکشو مات دانیشتبێ .

(٢٤) لاپوور : لاشەی ئاژەڵی تۆپیو ، یان مردارەوە بووە ، لە ڕووی سوکیەوە بەیەکێك ئەووترێ کەچاوەڕوانی مردنی یەکێك بکات ؛ بۆئەوەی بەمیراتەکەی شادبێت .

(٢٥) واتـە لاوازە .

(٢٦) واتە سەری لێشێواو .

(٢٧) لەڕووی سوکیەوە ، بەیەکێك ئەووترێ ، لەبەر فیزو خۆبەزلزانین لووتی خۆی بەرزبگرێ ( ولا تصعر خدك للناس ولا تمش في الارض مرحا ان الله لايحب كل مختال فخور ) قورئانی پیروز ، سورەی لوقمان .

(٢٨) بەیەکێك ئەوترێ ، کەبێدەنگ دانیشتبێو هیچقسەیەك نەکا .

(٢٩) واتە لاوازو پیسو ناشیرینە .

(٣٠) واتە بەدەنگی بەرز قسەئەکاو کردوویەتی بەگاڵە گاڵ .

٣٧ـ ئەڵێی کەر لەپەروو دەرئەکا (٣١)
٣٨ـ ئەڵێی کەری حەرامە (٣٢)
٣٩ـ ئەڵێی سەی تەنیاماڵەیە (٣٣)
٤٠ـ ئەڵێی کۆڵە هێلکەی هێناوە (٣٤)
٤١ـ ئەڵێی گۆشت‌ماسی ئەخوا (٣٥)
٤٢ـ ئەڵێی گەواری دەستی چەور پێوە دراوە (٣٦)
٤٣ـ ئەڵێی لەکۆچی قەرەچی بەجێ‌ماوە (٣٧)
٤٤ـ ئەڵێی مری بێ‌بەستراوە (٣٨)
٤٥ـ ئەڵێی مەلەوانی کونە لەدەست بەربووە (٣٩)

---

(٣١) بەیەکێك ئەووترێ ، کەبەبێ بەزەیی بەهەموو هێزێکیەوە بـــدا لەهەژارێك ، یان ماڵاتێکی بەسەزمان .
(٣٢) بەیەکێك ئەووترێ ، کەبێ‌قسەو سڵاو ورۆژباشێك سەری خۆی داخاو بەلای کۆڕو کۆمەڵێکا تێپەڕێ .
(٣٣) لەڕووی سوکیەوە بەیەکێك ئەوترێ بەتاقی تەنیا جوێن بە خەڵکی بداو قسەی خراپیان پێ بڵێ .
(٣٤) واتە بێ‌کەڵکەو نازو نوزیش ئەکا .
(٣٥) واتە لەسەرخۆو بەووردی نان‌ئەخوات .
(٣٦) گەوار : بەچکەکەوە ، کەلەگەڵ دەستی چەوری پێوە درا ئیتر پەکی ئەکەوێ ، بەیەکێکی کزوهە ژار ئەوترێ .
(٣٧) واتەپیس‌و پۆخڵ‌و چڵکنە .
(٣٨) واتە پەلی شـــڵ‌و شـــەکەت‌بووەو هـــێزی ڕۆیشتن‌و جوڵانـــەوەی نەماوە .
(٣٩) بەیەکێك ئەوترێ ، کەسەری لێ‌شێوابێ‌و کەوتبێتە هاتوو چۆ .

٤٦- ئەڵێی ناوکی بڕیوە (٤٠)
٤٧- ئەڵێی وورچی گولە لێدراوە (٤١)
٤٨- ئەڵێی وورچی گەمە نەکەرە (٤٢)
٤٩- ئەڵێی توولەی گوێ بڕاوە (٤٣)
٥٠ -ئەم گوێ بەرخە بۆ ئەو گوێ بەرخە (٤٤)

---

(٤٠) بەیەکێك ئەوترێ کەلەخۆی گەورەترێـك ، یـان بـا ئەوەندەی خۆیشی بێ ، هەربەناوەکەیەوە بانگی بکات ، واتە ناڵێ : کاك ، یان دادە ، یان پورێ ، یان مامە .... فلان کەس ، کەبەڕاستی ئەمـە شێوەیەکی زۆر ناشیریەو پێشینانمان بەنەنگێکی گەورەیان زانیوەو تائێستەش لەناو کوردەواریمانا هەرماوە ؟ بۆیە لەسەر دایك و باوك و مامۆستایان پێویستە کەوائامۆژگاری منال و قوتابیانیان بکەن و لەسەر بناغەی ڕێزو بەزەیی و خووڕەوشتی جـوان فـێرو پەروەردەیان بـکەن .
(٤١) لە ڕووی سووکیەوە ، بەیەکێك ئەوترێ ، کە هەر بۆڵە بۆڵی بێ .
(٤٢) بەیەکێکی زل و قەبە ئەوترێ ، کەبێ پێچیتە بەزم و سەمایەك و هیچی لـێ نەزانـێ .
(٤٣) واتە ئازاو جەربەزەیە ( لەڕووی سووکیەوە بەکارئەهێنرێ ) .
(٤٤) گوێبەرخە : گیایەکی توو کنی گەلائەستوورە ، کەلەزەوی ڕەقەن و بەرداویا ئەڕوێ ، ئەگێرنەوە ، کەشوانێك بەکارخۆێ کەی ئەڵـێ کەپێلاوی بۆبکڕێ ، ئەویش لەوەلامدا ئەمقسەیە پێئەڵێ ! واتـە لەم گوێ بەرخەوە بۆئەو گوێبەرخە پێدانێ ، ئیتر پێلاوت بۆچیە ؟! بەیەکێکی ڕژدو چرووك ئەووترێ .

٥١- ئەم ماستە موویەکی تیایە (٤٥)
٥٢- ئەمە لێلێیە ، لۆلۆ لەدوایە (٤٦)
٥٣- ئەوجا فەسڵ خۆش ئەبێ دار گەڵا ئەکاو (بەمۆ) ڕەش ئەبێ (٤٧)
٥٤- ئەو چاوە کوێر بێ حەڵوا نەبینێ (٤٨)
٥٥- ئەو خوڕەخوڕە هەمووی شیرنیە (٤٩)
٥٦- ئەوە بایءنایەت ، بۆیە شەنناکات (٥٠)
٥٧- ئەو کانیەی ئاوی لێئەخوێتەوە ، بەردێکیشی لێفڕێدە (٥١)
٥٨- ئەوە کوڕنیە ، بۆیە تۆ کوڕی خاسی (٥٢)

---

(٤٥) بەشتێك ئەوترێ ، کەواتاو مەبەستێکی بێچەوانەی ڕواڵەتە کەی تیابێ .
(٤٦) بەشتێك ئەوترێ ، کەچاوەڕوانی ئەنجامێکی خراپتری لێبکرێ .
(٤٧) بەمۆ : شاخێکە لەنزیك دەربەندیخان لەپارێزگای سلێمانی واتە ئەوە نیشانەی بەهارە .
(٤٨) واتە پیاو ئەبێ دۆستو دڵسۆزی خۆی بناسێو چاکەی لەگەڵ بکات .
(٤٩) بەیەکێك ئەوترێ کەخۆی هەڵکێشێو بڵێ زۆرم کردوە ، یان زۆر ئەزانم ، واتە هەمووی وانیەو زۆری درۆیە .
(٥٠) بەیەکێکی ئەڵێت ، کەبەپیاوێکی هێمنو لەسەر خۆ بناسرێت لەلایەن جەن کەسێکەوە ، واتە وانیە کەئێوە ئەیزانن،بەڵکو هەرکە ئازارێکی پێگەیی ، هەڵەوەڕو جووتەوە شێنە .
(٥١) ئەو شتە ، یان کەسەی کەکەڵکی لێوەرئەگری ، تائەتوانی بە چاکە ناوی بەرەو پشتی بگرەو یارمەتی بدە .
(٥٢) یەکێك ئەیڵێ ، کەشتێکی نەبێو زۆری بەلاوەباش بێ .

٥٩- ئەوەی بەختی باش بێ ، سەیشی خێرایە (٥٣)

٦٠- ئەوەی حەمامچی بێ ، ئەبێ تونچێتیشی کردبێ (٥٤)

٦١- ئەوەنەی دەمم هیلاك ئەبێ ، باقاچم هیلاك ببێ (٥٥)

٦٢- ئەوەنەی دەمم هەیلاك ئەبێ بادەستم هیلاك ببێ

٦٣- ئەوەی پیرێکی نەبێ ، با پیرێ بسێنێ (٥٦)

٦٤- ئەوەی لەژێرەوەیە هاواریەتی ، ئەوەیشی لەسەرەوەیە هەر هاواریەتی ! (٥٧)

٦٥- ئێشیك کەرۆ ، تاتێت کەرۆ (٥٨)

---

(٥٣) واتە ئەوەی کەڕۆژو هاتی بێ ، لەهەموو ڕوویەکەوە لێی دیاری ئەدا •

(٥٤) واتە ئادەمیزاد ئەبێ لەهەموو کون و قوژبنی ئیشەکەی خۆی شارەزاو قاڵ بێ •

(٥٥) واتە پیاو ئەوەنە بەیەکێك ئەڵێ ئەوئیشەم بۆبکەو تێی ئەگەیەنێ ، کە چۆن و چی بکات و کەی بڕواو چی بڵێ •• بەدەستی خۆی ، بەیاین خۆی بچێ بۆی باش و ئاسانتر •

(٥٦) چونکە پیر بەتاقی کردنەوەو دنیادیدەو بەڕاو تەگبیرترن تا وەکو گەنج •

(٥٧) واتە کەس لەم جیهانەدا چاوی تێرنابێ •

(٥٨) تاتێ : باوك واتە منداڵ ئەبێ لەڕێ و شوێنی باوکی خۆیەوە بڕوات • ئەم پەندە تاڕادەیەك وایە ؟ چونکە زۆر باوك بەنەخوێندەواری و هەژاری ئەمێننەوە ؟ لەبەرئەوە ڕەنگە سەریشیان لەفێڵ و فڕو دزودرۆزنی بخورێ ، بەڵام دیارە ئەم باوکانە ئیشیان باش بووە •

٦٦ـ ئینسان شیری خاوی خواردوه (٥٩)
٦٧ـ ئەڵێی مانگی گیراوه (٦٠)
٦٨ـ ئێمە قلیج موسلمانین ! (٦١)
٦٩ـ ئەترێ‌و ئەڵێ : ئەمڕۆ شەوی ڕەشەفارسە ! (٦٢)
٧٠ـ ئەڵێی بێ بەهێلکەدا ئەنێ ! (٦٣)
٧١ـ ئەڵێی سەی بەورە ڕۆژە (٦٤)
٧٢ـ ئەگەر بزن نەکا حێلە حێلی ، نێری ناکا بێلە بێلی (٦٥)

---

(٥٩) واتە شایستەی گۆڕانە لەخراپەوە بۆباش‌و بەپێچەوانەش •
(٦٠) بەئافرەتێکی جوان ئەوترێ ، کە پەژارەیەکی هەبێ‌و کاڵ بووبێتەوە •
(٦١) قلیج : وابزانم بەواتای بە زۆردێت • لەکاتێکا ئەوترێ ، کەمل‌هوڕی یەك کرابێ‌و بڵێن ئەمە خراپەو پێچەوانەی ئاینی ئیسلامە •
(٦٢) ڕەشە فارس : جۆرە حسابێکی زستانە ، کەزەوی هێشتا ڕەش‌ئەکاتەوە ( گیاسەوزنەبووە ) بەیەکێکی شرشێت‌و هیچ‌نەزان ئەوترێ ، کەهەر لە خۆیەوە قسەی بێ‌ڕێ‌و جێ‌بکات •
(٦٣) واتە لەسەر خۆی ئەڕوات •
(٦٤) بەیەکێك ئەوترێ کەجێ بەخۆی نەگرێ‌و کەوتبێتە هاتووچۆ •
(٦٥) نێری : ( سابرێن ) ە •

## پیتی – بێ –

١ ـ با ، خوانیه ، بەڵام لەزاتی خواوە نزیکە •
٢ ـ بازەڵەی خوێندویەتی •
٣ ـ باسی گشتی بووی ، باسی نانەبووی •

---

(١) ئاشکرایە ، کەخواوەندی گەورەو کردگار هەرکاتێك کەڕقی لەهەر نەتەوەو گەلو کۆمەڵێك گرتبێ ، بەهۆی سەرپێچیو لارەملیو بەجێ نەهێنانی فەرمانەکانیەوە ، فەرمانیداوە بە چەند کەرەستەیەکی کردگاری خۆی وەك باو باڵندەو لافاو بۆ لەناوبردنو خاپوورکردنیان ( وأما عاد فأهلكوا بريح صرصر عاتية ) • وە لە قورئانا لەزۆر شوێنا باسی ئەوەئەکات کەدنیا هەربەبا کۆتاییدێت ( ونفخ في الصور فاذاهم خامدون ) • وەگرنگیی ڕاستی ئەمپەندەلەوەدایە ، کە کەس خوای نەدیوەو نایبینێو بەسەر هەموو بوونەوەرێکدا بە بەزەییو تواناو دەسەڵاتە بایش نابینرێو کەسیش بەبێئەو ناژی •

(٢) بەلاوێك ئەوترێ ، کەتازە دڵی دڵداری پەیدا کردبێ •

(٣) ئەمە هەلاجێكو تووییەتی ، کەچەن کەسێك لەدەوروبەری دانیشتوون لەکاتیئیش کردنیاو ڕازی قسەیان دامەزراندووەو کەس ئاگای لەبرسێتی ئەونەبووە • واتە هەرکەسە خولیای پێویستی خۆیەتی •

٤ ـ بالەبـوو (١)

٥ ـ بالەسەوەتـە (٢)

٦ ـ باهەر بتڕێو بدابە پۆیەوە (٣)

٧ ـ بدابە لای مردوا ، کفنەکەی ئەدزێ ( ئەگرێتەوە ) (٤)

٨ ـ برنج سپی نەکرێ ، نابرێتە بازاڕ (٥ )

٩ ـ بزن فەقیرە کەسەری ئەبڕن (٦)

١٠ـ بزنمان نەدیوە ، پشقەڵمان دیوە (٧)

١١ـ بڵێ ماست ڕەشە ، باوەڕی پێ ئەکەم (٨)

---

(١) بەیەکێك ئەوترێ ، کەباسێکی چاکەی بکرێو هەڵی نێن ، ئەویش لووتی خۆی بەرز کاتەوە •

(٢) واتەمۆنو ڕکەڕك کەرو قیرسچمە •

(٣) لە رووی سوکیەدە ، بەیەکێك ئەوترێ ، کە لەپاش ملە قســە ، یان هەڕەشەیەکی کردبێ لەیەکێکی تر • واتەهیچی لەدەستنابێ چیئەکا با بیکا •

(٤) بەدزو تەماکار ەئوترێ •

(٥) واتە پیاو تاشارەزاو قاڵنەبێ لە ئیشێکا نابێبیدەنە دەستی •

(٦) یەکێك ئەیلێ ، کەپێی ناخۆش بێ بلێن :هەژارو دەست کورتی ، یان کزو بێ دەنگی •

(٧) بە یەکێکی ئەڵێت کەخۆی لەتۆ شارەزاتردانێ •

(٨) بە یەکێکی زۆر ڕاستگۆ ئەووترێ •

١٢- بڵی ماست سپیە ، باوەڕی پێ مەکە (٩)
١٣- بەتەمای شیری مانگا بۆرە (١٠)
١٤- بەچڵەو دووچڵە ناکەوێ (١١)
١٥- بەپارە قەمچێن ئەکا (١٢)
١٦- بەحەو ( •••• ) شەمشەمەکوێرەیان دروست کرد ،
ئەویش باڵەکەی پەڕۆیە ! (١٣)
١٧- بە دووکەڵەوە ڕۆیو خۆیەنی (١٤)
١٨- بەراز پژمیوە ، مشك لەلووتی دەرپەڕیوە ! (١٥)
١٩- بەخوێی چێشتیش ناگەنە یەکتری (١٦)
٢٠- بەرد بگوشێ ئاوی مێ دەرئەکا (١٧)

---

(٩) بە یەکێك ئەوترێ ، لەبەر زۆر درۆزنی ، ڕاستیش بڵی کەس باوەڕی پێ نەکا • ئەم دووپەندە پێچەوانەی یەکترن ، یەکەمیان بۆ ڕاست گۆو دووەمیان بۆ درۆزن بەکاردێت •
(١٠) واتە هیوایەکی هەیە بۆ دەست کەوتنی شتێك •
(١١) چڵە : دارێکی سەردابڕاو ، یان دوفلانەیە کەهەڵ ئەدرێتە قـوڵفی دەوارەوە ، بەیەکێك ئەوترێ ، کە لەئیش یانقسەیەکا کۆڵنەدا •
(١٢) واتە دەوڵەمەنە •
(١٣) بە چەن کەسێکی تەشارەزا ئەوترێ ، کەلاسایی گەورە وزانایـەك بکەنەوەو ئیستەکەشیان ناپوختە دەرچێ •
(١٤) واتە نەوسنە •
(١٥) بە دووکەس ئەوترێ ، کەیەك لەیەك خراپتربن •
(١٦) واتە بەهیچ جۆری بەخزمایەتی ناگەنە یەکتری •
(١٧) بە یەکێك ئەوترێ ، کە هەموو ئیشێك بەدەستی ئاسان بێت •

٢١- بەڕیش نیە ، بەشیشە ! (١٨)
٢٢- بەد ئاگری نەگرێ (١٩)
٢٣- بە دۆعا (لوورە)ی سەگ بێ ، ئێسقان ئەبارێ (٢٠)
٢٤- بەترِی لۆتی هەڵەپەڕێ (٢١)
٢٥- بەزۆربێ ، یان بەخوایشت (٢٢)
٢٦- بەڕوویەك بۆبرسی‌یەك ، قەلایەكە (٢٣)
٢٧- بەشدارم ، خۆزۆردار نیم (٢٤)
٢٨- بەشی‌كەو ، هەر ڕێزە (٢٥)

---

(١٨) پیاوێكی بەساڵاچوو بەگەنجێكی ئەڵێ كەئەم توانجێكی پیریەكەی تێبگرێ ، واتەبەوەنیە كەمن ڕیشم سپیە ، بەڵكو لەتۆ بەكارتـرم لەفلانە فەرماندا ! •

(١٩) واتە پیاوی خراپ ، یاخوا رۆژی نەیەت •

(٢٠) واتە هەموو شتێك بەئارەزووی پیاو نابێت •

(٢١) بێژیری ئەگەیەنێ •

(٢٢) واتە ئەوشتەم هەرئەوێ لێت‌ئەسێنم ، باقایلیش نەبێت •

(٢٣) واتە پیاو پێویستی بە شتێك‌بوو كەمێكیشی لێ‌دەست‌كەوێ باشترە لەوەی كە هیچی لێ‌دەست نەكەوێ •

(٢٤) لەڕووی بێ‌دەسەڵاتیەوە ئەوترێ •

(٢٥) ڕێز : زیخ ، یان لم‌و ووردە چەوە ، بەیەكێك ئەوترێ ، كە هەژارو بێ دەسەڵات‌بێ‌و چاوەڕوانی پلەو پایەیەكی لێ‌بكەن ، واتە شتی‌وا بۆ هەژار نابێ •

۲۹ـ بەشەکەی من کەنێ وەجەلەوەی (۲٦)
۳۰ـ بەشێکم ئەوێ سەرۆنراوبێ ، بەشێکم ناوێ بەزۆسنراوبێ (۲۷)
۳۱ـ بەقلانگ ( گ •• ) ناگاتە لووتی (۲۸)
۳۲ـ بەگم بەگم ، جلگا لەکۆڵ حاڵی سەگم (۲۹)
۳۳ـ بەمێوژی بدەم نووکی‌هەیە ، بەگوێزی بدەم پەلکی هەیە (۳۰)
۳٤ـ بەمردویی ڕەشی خست (۳۱)
۳٥ـ بەنووکی‌بێ ئەڕوا بەڕێوە (۳۲)

---

(۲٦) کەنێ : بیکەن • جەلە : تاڵەدەزوو ، شـووڵ ، یان شـتێکی وەك سیخی گۆشت برژاندن وایە • بەزمانی پیاوێکی پیری لێ کەوتـەی کۆنە دزەوە ئەگێڕرێتەوە لەکاتێکا کەمناڵەکانی گۆشـتی دزی‌یـان هەبووە ، گوایا خۆی نارەوا ( حەرام ) ناخوات • بەیەکێك ئەوتری کەبەڕواڵەت حەلاڵخۆرەو وەیتریشش هیچ •
(۲۷) واتە ئەو شتەی کەبەتایبەتی بۆمنەهاتبێ ، نامەوێ •
(۲۸) تلانگ : دارێکی‌درێژی سەرقولایـە ، لەناوچـە باخاوی‌یەکانـدا بەکاری ئەهێنن ؛ بۆ لێ‌کردنـەوەی ئەومیـوانەی کەبـەلق و چلـە بەرزەکانەوەن دەست نایانگاتێ ، لەرووی سوکی‌یـەوە ، بە یەکێـك ئەوترێ کەلووت‌بەرزو فیزاوی‌بێ •
(۲۹) یەکێك بە خۆی ئەڵێ کە ناوبانگێکی گەورەو سـامانێکی کەمـی هەبێ • ت
(۳۰) نووك : قنچك • پەلك : توێکڵ • واتە ئەوپارەیە بەشی ئەو سەوداو مامەڵەیە ناکات •
(۳۱) واتە ئەوەندەی لێ‌دا بێ‌دەم و زوانی خست •
(۳۲) واتەفیری زل‌و دەماری ئەستوورە •

٣٦- بووبە بلەی هەژدەگجی (٣٣)

٣٧- بووبە بگرەو لێنیشە ( بوو بە بگرەو بەردە ) (٣٤)

٣٨- بووبە پەڕۆی بێنوێژ (٣٥)

٣٩- بووبە خەجەڕۆ (٣٦)

٤٠- بووبە دێوی قنگ دوراو (٣٧)

٤١- بووبە سەگی ناو سەگەل کەوتوو (٣٨)

٤٢- بووبە شێخی شەو لێگۆڕاو (٣٩)

٤٣- بووبە کەڵەشێری زەماوەن (٤٠)

---

(٣٣) گجی : کراس ، بەیەکێك ئەترێ ، کەبەبەشی خۆی دانەکەوێ •

(٣٤) بەکارێك ئەوترێ ، کە هەرکەسە بەجۆرێك پێی هەڵسێو کەس ئاگای لەکەس نەبێ •

(٣٥) واتە نرخی نەماو تڕۆبوو •

(٣٦) بەشتێك ئەوترێ ، کە قەڵەباڵغیەکی زۆری بەسەردا بکرێو لەبەر دەنگەدەنگو قیژوهوڕ کەس ئاگای لەکەس نەبێ •

(٣٧) بەیەکێك ئەوترێ ، کەلەبەر سەرقاڵیو جەنجاڵی خۆی ، ئارامی لێ بڕابێو سەری لێشێوابێ •

(٣٨) بەیەکێك ئەوترێ ، لەڕووی‌سووکی‌یەوە ، کەچەن کەسێـــك دابێتیانە ناوخۆیانو دەستیان کردبێ بەتێهەڵدانی •

(٣٩) لەڕووی ڕێزەوە ، بەیەکێك ئەوترێ کەوەختی لێنێك چووبێ •

(٤٠) بەیەکێك ئەوترێ ، کە بۆ هەرکوێ بــڕوا ، قاوی‌دەنو دەوری لێ چەواشە بووبــێ •

٤٤ـ بووبە مشکی سەرخەزێنە (٤١)

٤٥ـ بووبە پووش برنج (٤٢)

٤٦ـ بوو بوو ، نەبوو کەڕەپوو (٤٣)

٤٧ـ بۆنبکەبە بەرۆکی خۆتەوە (٤٤)

٤٨ـ بۆنی بۆکڕووز لەناوشانت نەبڕێ (٤٥)

٤٩ـ بۆهەر دەردە دەرمانێك (٤٦)

٥٠ـ بیستویەکی ئاداریێ ، بەفربگاتە پاساریێ ، نامێنێ تاهێواریێ (٤٧)

٥١ـ بیستویەکی ئادار، سەریدارو بنیدار، تێرخواردنی بزنوکار(٤٨)

٥٢ـ بەو حاڵە نابین بەو ماڵە (٤٩)

٥٣ـ بێ دەستنوێژ ، نوێژ مەکە (٥٠)

٥٤ـ بێشك بەکۆڵ دای لە ( کەلیخان ) (٥١)

---

(٤١) بەیەکێك ئەوترێ ، کەکەوتبێ بەسەر نازو نیعمەتێکدا •

(٤٢) واتە سووكو بێنرخ بوو •

(٤٣) کەڕەپوو : هیچ • بەشتێك ئەوترێ ، کە ئەگەر نەش‌بێ پەکت لەسەری نەکەوتبێ •

(٤٤) واتە ئەم کارە ، یان قسەیە بۆتۆ نەهاتووەو خۆت بناسە •

(٤٥) نزای چاکە بووە ، واتە مەڕو ماڵات لەدەرماڵت نەبڕێ •

(٤٦) واتە هەموو نەخۆشیو تەنگو چەڵەمەیەك ، چارەیەکیهەرهـەیە

(٤٧) چونکە بەهارەو هیچ حسابێکی زستان نامێنێ •

(٤٨) واتە بەهارەو ماڵات تێرگیا ئەخوات •

(٤٩) واتە کاریگەورەو بایەخدار ، بەئاسانی پێك نایەت •

(٥٠) واتە هیچ کارێك مەکە ، کە خۆتت بۆ ئامادە نەکردبێ •

(٥١) واتە فەسڵ خۆش بووە •

٥٥ـ بەغ مەکە ، وەبەغ زەبوونی (٥٢)

٥٦ـ بخۆ بەردی ڕەش ، بکە خەوی خۆش (٥٣)

٥٧ـ بخۆ خۆڵەکەوێ ، شوومەکە سەربەهەوێ (٥٤)

٥٨ـ بووبە عەباکەی مام ڕێوی (٥٥)

٥٩ـ بۆی تێکەو چاوی لێکە ! (٥٦)

---

(٥٢) بەغ : گاڵتەپێکردن‌و خۆ بەزل زانینە بەرامبەر بەیەکێك کــە کەتن‌و قۆرتێك هاتێتە ڕێی . واتە وامەبە نەوا خۆیشت تووشی ببیت .

(٥٣) خواردنیشت ناخۆش بێ ، بە ئاشتی‌و ئاسوودەیی بژیت چاکترە .

(٥٤) ئافرەتێك ئەیلێ کەنەیەزێ ژنی بەسەر بێ .

(٥٥) بە بەڵێنێك ئەووترێ ، کەدرۆزن دابێتی بــۆ دەسخــەرە کردن‌و فریودان .

(٥٦) بەیەکێك ئەوترێ ، کە هەر بخۆر بەگ بێ‌و هیچی‌تر .

## پیتی – پێ –

١ ـ پزووەکەی پووریێ ( پەنان ) ، شاپانەی پۆمو عەجەمە •
٢ ـ بەرەکەت ، جۆخین‌کەت •
٣ ـ پەنجە بخەرە دەمیەوە ، بزانە ئەیگەزێ ؟!•
٤ ـ پیاو چووە شاری کەچەڵان ، ئەبێ دەست بگرێ بەسەریەوە •
٥ ـ پیاو پقی لەبەنەخوێنیِ خۆی هەڵسێ ، گووئەکا بەخۆیا •
٦ ـ پیاو قسەیەکیش بۆخوابکا ! •

---

(١) بەشتێك ، یان شوێنێك ئەوترێ کە ، وابزانرێ پەنهانیە ، وەکی تریش ئاشـکرابێ •
(٢) پەرەکەت : پەڵەدای • واتە پەڵەپـدا ، خـەرمانانیش ئەبـێ ، کەم بـێ یـان زۆر •
(٣) لە رووی گاڵتە پێ‌کردنەوە بەیەکێك ئەوترێ ، کە خۆی بەمناڵ یان کەم زانی پیشان بدات •
(٤) واتە پیاو کەچووە جێگایەك ئەبێ چاودێری پەوشتی دانیشتوانـی بکاو پێزیان لێ‌بـگرێ •
٥ ـ لە خزمو دۆستو هاو وڵاتیان توڕەمەبە ؛ چونکە لەوان سوودمەن ئەبـی •
(٦) واتە وەك خرایە هەیە ، چاکەش هەیـە وەك یـەکەم ئەڵـێ‌ی دووەمیشیان بـڵێ •

٧ ـ پیاو کەڕۆژی نەبوو (نەگبەتی‌هات) بەگۆڵەی‌ماست دانی‌ئەشکێ (١)

٨ ـ پیاوی ترسنۆك ، کوتەکی زلە (٢)

٩ ـ پیاوی ترسنۆك ، لەبەردی زل ئەنەوێ بۆشەڕ (٣)

١٠ـ پیاوی پیاوکوژ ، ڕەشتاڵەیەو بەرانلووت (٤)

١١ـ پیاوێ گورگ خواردویەتی‌و باوکم دیارنیە ! (٥)

١٢ـ پیاو میرووولەیەکیش دوژمنی نەبێ باشە (٦)

١٣ـ بێ‌ئەکەنم ڕانەکەم ، دنیا چۆن‌ا بێ وائەکەم ! (٧)

---

(١) گۆڵەی ماست: لکەکەیەتی، یاخوا هیچ دۆست‌و هاو نیشتمانیەکی دڵسۆزی میللەت نەگبەتی نەیەت ؛ چونکە خوا نەخواز کەهات ئاگای لەخۆی نابێ‌و دەست‌و دەمی تەتەڵە ئەکات .

(٢) تانەی‌وەشێنێ ؛ چونکە ئەگەر ئازابێ بەدەست‌و قاچی شتێ هەر ئەکات .

(٤) بەیەکێك ئەوترێ ، کەخۆی بەنیشێکەوە هەڵکێشێ ، واتە تـــۆ

(٣) چونکە ناوێرێ بیوەشێنێ .

پیاوی ئەم جۆرە ئیشانە نیت .

(٥) یەکێـکی کەم زانست‌و گەمژە ئەیلێ ، کە هەست بەو شتەنەکات پێوەندیی بەخۆیەوە هەیە .

(٦) دوژمن دەستی خۆی ئەوەشێنێ ، بابچوکیش‌بێ .

(٧) یەکێکی خۆو هەل پەرست ئەیـلێ ، کەبەشداریی پـەژارەی کۆمەڵ‌و دۆست‌و دراوسێ نەکات‌و دنیاش هەر چۆن‌بێ ، خـۆی لەگەڵا ڕێك خات ، واتە پیاو نابێ‌وابێ ، بەڵکو بەپێچەوانەوە .

١٤- پێت ئەوەستم ، ڕاناوەستم (٨)
١٥- پێ‌ی‌زل بێلوەتە ، سەری زل دەوڵەتە (٩)
١٦- پێستی لەکەڵکی کونە کەوتووە (١٠)
١٧- پیلا لە پیلا ناگرێ (١١)
١٨- پێ‌کەنینی بەنەقر ، لەبۆبەندەی بێ ئەقر (١٢)
١٩- پێویستی‌ی ، یەکەم مامۆستایە (١٣)

---

(٨) پێت ئەوەستم : چارت ئەکەم ، دەرەقەتت دێم . یەکێك بەیەکێکی تری ئەڵێ کەشەڕی پێ‌بفروشێ‌و وازی لێ‌نەهێنێ .

(٩) بەپێ‌ی ئەم پەندە ، ئەبێ پێ‌زلەکان هەر هــەژارو مەینەتی‌بــن‌و سەر زلەکانیش خاوەن سامان ! .

(١٠) واتە پەکی کەوتووە ، ئیتر لەبــەر پیری‌بــێ ، یان هەژاری‌و نەخۆشی ... تاد .

١١- پیلا : پۆڵا . واتە دووکەسی وەك یەك توانا ، یان زانا ، ناچــن بەگــژ‌یەکا ؛ چونــکە هــەردوو وەك یــەك زیانیــان پێ‌ئەگات ، پیرەمێردی شاعیر ئەڵــێ :ــ

بەردی سەرشکێن لەیەك بدرێن

بەرگەی یەك ناگرن ، زوو هەڵئەوەرێن.

(١٢) نەقر : مەبەس قاقای پێکەنینە . ئەقر : عقڵ . واتە هەموو شت لەڕادەی خۆیدا باشە .

(١٣) چونکە پێویستی ، وا لەئادەمیزاد ئەکات ، کەبیر بــکاتەوە بــۆ چارە دۆزینەوەو داهێنان .

## پیتی ـ تێ ـ

١ ـ تائەوسا لەوکونەوەبێ ، حاڵمان لەمە خۆشتر نابێ •

٢ ـ تاتێواره قوتێ و بەلێ‌یه •

٣ ـ تابۆنان ئەچێت (ئاو) (دۆ)ت نەبێ •

٤ ـ تار بەبێ دۆ ناڕوا ، نیسان بەبێ جۆ ناڕوا •

٥ ـ تاڕەنج ئەکێشی گەنج نانۆشی •

٦ ـ تاقانه بێ بەرەکەته •

---

(١) بەکۆسپێك ئەوترێ ، کە نەیەڵێ ئیشەکەت بکەی •

(٢) قوتێ‌و بەلێ : (بزن)ن یەکەمیان گوێ کورت‌و دووەمیان درێژ کۆلەو لوولە • بە شتی‌کەم ئەووترێ •

(٣) نزای خراپەیە ، واته یاخوا هەژارو نەدارا بیت •

(٤) تار : یەکەم هەفتەی مانگی مارته •

(٥) هەوڵ‌و تەقالا دەست کەوتی ئەبێت •

(٦) شتی کەم زووتر چاوەڕوانی نەمانی لێ ئەکرێت •

٧ - ئامن تۆم گرت ، تۆمنت گرت (١)

٨ - تانجی بەزۆر ببرێ بۆڕاو بەنێچیرا ناڕوانێت (٢)

٩ - تانجی بەکوتەك ببرێ بۆڕاو ، نێچیر ناگرێت

١٠- ترشکە لەخۆی‌شکە (٣)

١١- تف بکاتە دەمی مار ، ئەی‌تۆپێنێ (٤)

١٢- تفەنگ‌و ماین‌و (••) بەدەست خاوەنیانن (٥)

١٣- تف هەڵدەی ئەیبەستێ (٦)

١٤- توورەکە بکەن بۆ دەستم ، باخۆڵ نەخۆم (٧)

١٥- تاپێستی ڕۆیوە ، پەنامیشی ڕۆیوە (٨)

١٦- تس لەژێری بانابیا (٩)

---

(١) واتە ئاویستم گلەیی خۆمت لەلا بکەم ، تۆ دەست پێشخەریت کرد، یان ئاویستم نەنگت بلێم ، نەنگدارت کردم •

(٢) واتە هیچ ئیشێك بەزۆرە ملێ ناکرێ •

(٣) بەیەکێك ئەوترێ، کە کەم‌و کوڕی‌یەکی هەبێت ، وەلە هەر کاتێکا باسی ئەوکەم‌و کوڕی‌یە بکرێ ، با لەگەڵ ئەویشی نەیێت ، بیباتەوە سەر خۆی •

(٤) بەیەکێکی زۆر پی‌و بۆگەن ئەوترێ •

(٥) واتە بەخاوەن کەوتوون کەباش بن یان خراپ •

(٦) واتە زۆر ساردە •

(٧) خۆ گێل کردن ئەگەیەنێ •

(٨) واتە قەڵەوو تێکسمڕاوە •

(٩) بەتەمەڵ‌و تەوزەل‌و دەبەنگێك ئەوترێ ، کەهەمیشە دانیشتبێ‌و ئیشێك نەکات •

١٧- تووكە مردارەی فڕێداوە (١٠)
١٨- تەنیایی بۆخواباشە (١١)
١٩- تەوقی سەریشی هەرچاوە (١٢)
٢٠- تەون کێ کردی ؟ ئەوەی بڕی (١٣)
٢١- تەونی بێ تان‌و بۆ هەڵمەخە (١٤)
٢٢- تەونی بێ تان‌و پۆی بەدارەوەیە (١٥)
٢٣- توێکی‌تس ئەگرێتەوە ! (١٦)
٢٤- تووکی هەڵکێشی ، ڕۆنی لێ ئەتکێ ! (١٧)

---

(١٠) واتە گەڕۆزە بووەو هۆشی کردۆتەوە •
(١١) یەکێــکی بێ‌کەس‌و کارو خــزم‌و خوێش ئەیــڵێ ، کــە خوانەبێ ، کەس شك نەبات •
(١٢) واتە زۆر ووریاو پسپۆڕە •
(١٣) لەکاتێکدا بەکار ئەهێنرێ ، کە کۆمەڵێك بەکارێکەوە مانــدوو بووبن‌و لەئەنجامدا بەدەستی یەکێکیان تەواو بووبێ ، وەهەر ئەم خۆی پێوە هەڵکێشێ ! •
(١٤) هەموو کارێك خۆ ئامادە کردنێکی ئەوێ •
(١٥) بەیەکێــك ئەووتــرێ کەئیشێــکی بێ‌ســەرو بــن‌و کەرەســتەی بەدەستەوە بێ •
(١٦) لە ڕووی ســووکی‌یــەوە ، بەیەکێــکی زۆر تەماکارو چرووك ئەوترێ •
(١٧) واتە زۆر قەڵەوە •

## پیتی – جیم –

١ – جارێ ( گ •• ) درێژ ئەبێو جارێ ( ک •• ) •
٢ – جاڕی ماڵێ پاشا لەکوێ وەیە ؟
٣ – جارێ‌ناڵێ قەورسان فاتیحا •
٤ – جوانی‌بەدەستی ، کەس‌بێ‌ی‌ناوەستی •
٥ – جێ بۆ ئیش‌نەکەر نیە •
٦ – جێ‌ی سووتوان سەوز ئەکاتەوە •

---

(١) لە ڕووی سووکی‌یەوە بەدوو کەس ئەوترێ ، کە هەر جارە یەکێکیان دەستی بڕوات •

(٢) جاڕ : پەرێز • شوێنی هەر بەرهەمێکی کشتوکاڵیە ، کە بەداس دوورابێتەوە ، وەك گەنمو جۆ ، یان دەسکە نەکرابێ نۆك ونیسك ، بەزمانی پیرەژنێکی هەژارو دەبەنگەوە ئەگێڕرێتەوە ، کە درەنگ کەوتۆتە خۆی بۆ گوڵەوە چنی •

(٣) لە ڕووی گلەیی‌یەوە ئەوترێ ، واتە بۆ سەرێکمان لێ‌نادەی ؟•

(٤) واتە هەر جوانی سروشتیی باشترە •

٧ ـ جێی سەرم بێتەوە ، جێی پێم ئاسانە (١)

٨ ـ جلی تۆیشمان بەشان (٢)

٩ ـ جلێکی پیادە (٣)

---

(١) بەیەکێک ئەوترێ ، کەهەر ئەوەندەی تۆزێ ڕووی خوشی بدەیتێ ، ئیتر شۆڕی کاو دەمی زیادە بژەنێ •

(٢) لە ڕووی سووکی‌یەوە ، بەیەکێکی بێنموودی ئەڵێی کە گاڵتەیەکت پێ بکات •

(٣) واتە بێ دەنگ بە •

## پیتی - چێ -

١ - چ ئاسکەکە بۆمن کەروێشکەکە بۆ تۆبێ ، چ کەر .
- وێشکەکەبۆتۆ ئاسکەکە بۆمن‌بێ ! .

٢ - چاکە بەچاکە چاکە .

٣ -چاکە بەدوو کەس ئەکرێ .

٤ - چاکەی سەربەخۆ ، سەری خاوەنی ئەخوا .

---

(١) فێڵ‌بازو خۆپەرستێ بەیەکێکی تری ئەڵێ ، بەم جۆرە کە هەر چۆنێ بێ ، هەر بەشی گەورە بۆ خۆی دانێ .

(٢) هەر وەك خراپەش هەر بەچاکە ، چاکە . مامۆستا قانع ئەڵێ : - چاکە بەچاکە چاکە چاوەکەم بەدیش‌بێ هەر چاکە کاکی سەروەر .

(٣) واتە پیاو نابێ تەنها چاکەی بۆ خۆی بوێ ، بەڵکو ئەبێ یارمەتی خەڵکیش بدا ، تابڵاوبێتەوە بەناویاناو کەڵکی لێوەرگرن .

(٤) واتە چاکە لەگەڵ یەکێکا مەکە ، کە صێویستی پێی نەبێ‌و ئاگای لێ نەبێ ، وەك ئەمە کەشتێکی بەدیاری بۆ بەبێ‌و ئەو لەودیاری‌یە زۆر هەبێ‌و لای بێ نرخ بێ .

٥ ـ چاکە لەگەڵ ناکەس بەچەدا ، پەشیمانی لەدوایە (١)

٦ ـ چاو چاو نابینێ (٢)

٧ ـ چاوش کەبرسی بێ ، بیری کفتەی شایی ئەکاتەوە (٣)

٨ ـ چاوم فڕی (٤)

٩ ـچاویان بۆدین داناوە(٥)

١٠ـ چی بکەیتەعەمباری ، هەرئەوە دێتەخواری (٦)

١١ـ چۆلەکەی کوێر ، خوا هێلانەی بۆئەکا (٧)

١٢ـ چزنم بەدەست خۆمە ، هاتنەوەم بەدەست خوایە (٨)

---

(١) ناکەس بەچە : سپڵەو پێ نەزان‌و ناوەجاخە ، کە هەر چاکەیەکی لەگەڵ بکەی کەڵکی نیە •

(٢) واتە زۆر تاریکەیە •

(٣) واتە لەکاتی نەبووندا بیر لەکاتی بوون ئەکرێتەوە •

(٤) یەکێك وا ئەڵێ ، کەچاوەڕوانی هەواڵێکی خـۆش‌بێ‌و بەناخۆشی بۆی هاتبێ ، واتە هەرزانیم وانیە •

(٥) واتە هەر کارێك تا جوان لێی ووردنە بیتەوەو مەیکەو هەرماڵێکت بەدڵ نەبوو ، مەیکڕە •

(٦) واتە پیاو کردەوەی خۆی دێتەوەڕێی ؛ بۆیە پێویستە کردەوەی چاك بکەین •

(٧) بەیەکێکی بێ دەسەلات ئەوترێ ، کەخوا دەرویەکی لێ کردبێتەوە

(٨) هەر خوا ئەزانێ لەهاتنەوە چی ڕوو ئەدا •

١٣- چۆن بی‌بۆم ، واتەبم‌بۆت (٩)

١٤- چۆنم ببینی وات ئەبینم (١٠)

١٥- چەقۆو یاروو بەدەست خۆتە (١١)

١٦- چەمی ، چەمی ، نەچەمی ، بۆچەمی(١٢)

---

(٩ ، ١٠) واتە لەگەڵ خەڵکیدا باش‌بە ، ئائەوانیش بۆت باش بن .

(١١) واتە ئارەزووی خۆتە کەچی بکەی ، یان چی بڵێی .

(١٢) واتە هەرشتێ بەکەڵك نەهات خۆتی‌پێوە خەریك‌و ماندوومەکە .

## پیتی - چیم -

١ ـ حول‌حولی مەزەوە •

٢ ـ حوشترو قاپ‌قاپیان نەوتوە •

٣ ـ حوکمەت کەروێشك بەعارەبانە ئەگرێ •

٤ ـ حەق تاڵە •

٥ ـ حەقە بۆیە ڕەقە •

---

(١) مەزەو : مەزهەب • واتە کەللە ڕەقە •

(٢) بەیەکێ ، ئەوترێ کەشتێ بکاو لێی نەیەت •

(٤ ، ٥) یەکێکی خۆپەرست بەکاریان ئەهێنێ ، کە ئەگەر هەقی بەسەرا بچەسپێنی زیانی پێ‌بگات ؛ چونکە خۆی هـەموو کردەوەیەکـی ناهەقی‌یە • ئەم دووپەندە لەکوردی ناچن ؛ چونکە کورد ئەڵێ : لەهەق ئاو ئەوەستێ ( بەندی پێشینان ـ شێخ محمدی خاڵ ) •

هەق ئەگەر کەسێکی بەتواناو دەسەڵاتدار بووایە ، دەمو قەپۆزی زۆر کەسی ئەشکاندەیەك‌و گۆڕی ئەکردن ؛ چونکە لە زۆرشوێن‌و کات‌و دەوردا ، جەورو ستەمی وا بەناوی هەقەوە بەڕێوە ئەچێ ، کە سەگیش بێزی نایێ بۆنی پێوە بکات •

٦ ـ حەواڵە بەگەواڵەیە (١)

٧ ـ حەیا نەمەنەن ، شعور نەمەنەن

ئەویشە مەنەن ، رووی‌کردە بەنەن (٢)

٨ ـ حوشتر بڕەوێتەوە ، ناگەڕێتەوە (٣))

٩ ـ حوکمەت خوای سەر عەرزە •

---

(١) بە ئیشێك ئەوترێ ، کەبەدەبەنگێك سپێررابێ ، یان دەستی دەستی زۆری بێ‌کرابێ ، بەجۆرێك کەدەرنــگ بێتە ئەنجام •

(٢) نەمەنەن : نەماوە • بەنەن : چیاو چۆڵ ، یان بەرزاییی‌و ترۆپ • بەیەکێکی رووهەڵماڵراو ئەوترێ ، کە بێ شەرمی‌یەکی کردبێ •

(٣) بڕەوێتەوە : بسڵەوێتەوە ، بزەواقێ •

## پیتی - خێ -

١ - خاوەنی قسەی خۆی‌نیە •
٢ - خوا بەنە شناسە •
٣ - خورد برۆ ، پوختە برۆ •
٤ - خۆت بێنەو خۆم بینە •
٥ - خۆی ڕەشتووە •

---

(١) واتە دەم دەمی‌و درۆزنە •
(٢) خوا خۆی بەنەی خۆی ئەناسێ • واتە ئەگەر یەکێکی بەختەوەر کردو یەکێکی تری گیرۆ دەکرد ، تۆ نەبۆ یەکەم بێت ناخۆش‌بێ، نەبۆ دووەم بکڕو زێرەوە ؛ چونکە هەردوکیان شایستەی ئەوەن کە خوا بۆی داناون •
(٣) خورد : وورد • واتە چەن لەئیش‌وکارتا بەووردی‌و بێ‌هەڵەشەیی بیت ئەوەندە ئەو ئیشە پاك‌و پوختەو بێ لەکە دەرئەچێ‌و پاشەڕۆژ لەکارەکەت بەختەوەر ئەبیت •
(٤) واتە منیش وەکو تۆ وام •
(٥) بەگەنج ( بەتایبەتی ئافرەت )ێك ئەوترێ کەخڕو خۆڵ‌و جوانکیلە بوو بێت‌و پێ‌گەیشتبێ •

٦ ـ خورمایشی ئەوێو خورمزیش (١)

٧ ـ خوڵکەکەی خوڵکە ( بەردەبەل )ی‌یە (٢)

٨ ـ خوڵکەکەی نەیجە خوڵکە (٣)

٩ ـ خوویەك گیرا بەشیری ، یان مەرگ بیبا لەبیری (٤)

١٠ـ خۆ پێت نیە وەخەنەوە (٥)

١١ـ خۆ ( خلە )ی بێ‌ماڵ‌نیە (٦)

١٢ـ خۆ دەستی خۆمم بۆن‌نەکردووە (٧)

---

(١) خورمز : خورماو مێوژ • بەیەکێکی تەماکار ئەوترێ ، کـــە داوای دوو ، یان زۆرشت‌بکا

(٢) بەردەبەل ، یان بـــەردەوەل : دێ یەكبـــوو لەبنـــاری شارەزوور دیارە ئەودێ‌یە لالووت‌بوونە لەڕاست میوان کەئەمەش خوویەکی ناشیرینە لەکوردەواریماندا • بە خوڵکێـــکی ساردوسڕ ئەوترێ •

(٣) نەیجە : (قامیش)ە ، کە هەموو ئەزانین لەدەرەوە زۆر بتەوە ، بەڵام ناوەکەی بێجگە لەئاستی گرێ‌کانی ، هەمووی وەك شمشاڵ بۆشە ، بەخوڵکێك ئەوترێ ، کەلەدڵەوە نەبێ •

(٤) واتە هەر خوو وڕەوشتێك کە منالی پێ فێرکرا ، تامردن لەبیری ناچێتەوە •

(٥) لە ڕووی سووکیەوە بەیەکێـکی ئەڵێت کەبیەوێ نیشێکت پیابدا ، واتە ئەی خۆت بۆنای کەی •

(٦) بەیەکێك ئەوترێ کەبێ کارە بسوڕێتەوە •

(٧) واتە نەمزانی وای لێ‌دێ ، کاتێ بەکاردێ ، کەئیشێکت لەدەست قەومابێ وخەڵکی بڵێن : بۆ وات‌کرد ؟

١٣- خۆ دەستی کەری وەیسم نەبڕیوە (٨)

١٤- خۆ سەرگوێم هەڵ نەدڕیوە (٩)

١٥- خۆ سەرم لەبەرهەتاو سپی نەکردووە (٥)

١٦- خۆ سەری کەر نەخوراوە (١١)

١٧- خۆ شاخ و گوێی لێ نەڕواوە (١٢)

١٨- خۆ قارچك نیە ، لەزەوی دەرهاتبێ (١٣)

٩١- خۆڵی ماڵی خوای بۆ لەدەم ئەکا (١٤)

٢٠- خۆ کابە ( کەعبە ) کەچ نابێ (١٥)

٢١- خۆ ( گ •• ) نیت سەگ بتخوا (١٦)

---

(٨) ئەگێڕنەوە کەچەند دزێك چوار پەلی کەرەکەی وەیسی قەرەنـی ئەبڕنەوە ؟ بۆ دزینی ناڵەکانی کە ئاڵتـوون بـوون ! بەیەکێـك ئەوترێ کە گوناهێکی زل یان تاوانێکی گەورەی کردبێ •

(٩) واتە ئیتر چۆنی بناسمەوە ؟ لە ڕووی سووکیەوە بەکار ئەهێنرێ؛ چونکە گوێ هەڵدڕین بۆمالآتە ، تابناسرێتەوە •

(١٠) واتە خۆ بە خۆ ڕایی نەگەیشتووم بەم تەمەنە •

(١١) بەیەکێك ئەوترێ کە چروکی ، یان گران فرۆشیەك بکات •

(١٢) واتە ئیتر بۆ پێی پێ ئەکەنی ، یان سەرت لێی سوڕماوە ؟

(١٣) واتە کەس بێ کەس نیە •

(١٤) واتە زۆر ئارەزووی لێیەتی •

(١٥) واتە ئەم ئیشە ئەگەر بەشێوەیەکی تر بکرێت خۆ گوناەنیە •

(١٦) واتە بۆ ئەوەندەترسنۆکی ، لەڕووی سوکیەوە ئەوترێ •

٢٢ـ خۆ لەدوژمنی نابڕم (١٧)

٢٣ـ خۆی بۆخۆم‌و کچی بۆکوڕم هەرکەس قسەبکا سکی ئەدڕم (١٨)

٢٤ـ خۆی دەمی لاربوو ، کەچی ئەگەیشــتە هەر کەســ ، دەمێکی لێخوار ئەکردەوە (١٩)

٢٥ـ خۆی لێرەنیە ، خوای لێرەیە (٢٠)

٢٦ـ خۆی کرد بەبنێشتی دۆم (٢١)

٢٧ـ خۆ ( وەکاشە ) نیە ، با لەپشتی خەڵك بگرێ (٢٢)

---

(١٧) میوان بەخاوەن ماڵی ئەڵێ لەدوای نان خواردن‌و لەوکاتــەی کە خاوەن ماڵ بڵێ زیاتربخۆ •

(١٨) زۆر دارێکی دەست ڕۆیشتووی ملهوڕ ئەیڵێ کەقرمی خۆشــ کردبێ لەبێوەژنێك و کچەکەی بۆخۆی‌و کوڕی •

(١٩) بە یەکێکی کەم‌و کوڕی‌و تەنگدار ئەوترێ ، کەنەنگی خۆی بــە سەر خەڵکدا ساغ‌کاتەوە •

(٢٠) واتە با لەپاش‌ملەو بەخراپە باسی‌نەکەین؟چونکە خوا ئاگای لێ‌یەو تۆڵەی ئەکاتەوە •

(٢١) واتە خۆی خۆشەویست ئەکاو خۆی ئەشارێتەوە ، چونکە ئیشت بێ‌یەنی •

(٢٢) وەکاشە : شەخسە بەیەکێك ئەوترێ کەهیچ کردەوەیــەك یــان خزمەتێکی گەورەو بەکەڵکی نەبێ‌و نازو نوزیش بکــات ، واتــە وەختێ خۆت بەبایەخدار بزانە ، کەڵکێك بگری •

٨٢ـ خۆی کرد بەڕێوی تۆپیو (٢٣)
٢٩ـ خەت‌و لەت (٢٤)
٣٠ـ خەڵك دوستیشی هەیەو دوژمنیش (٢٥)
٣١ـ خۆین گرتویەتی ، یان (خوێنێك وابە ناوچە وانیەوە) (٢٦)
٣٢ـ خەڵك ماڵ ئەکا ، ئەو ماقڵە ( ئەکا ) (٢٧)
٣٣ـ ( خەنان )بێ‌و کووزەڵە نەخوا ! (٢٨)

---

(٢٣) لەڕووی سووکی‌یەوە ، بەیەکێك ئەوترێ ، کەبەفێڵ‌و فڕ خۆی نەخۆش خستبێ‌و لێی کەوتبێ‌و چـرچی دەسـت‌و پێی خـۆی بڕی‌بێ •
(٢٤) واتە هەرهێڵێکی جوت کردن ( بەگاوکـەرو ئێستر ) ، جـوتیار لەتێ‌نانی خواردوە ! بەم جۆرە زۆر خۆری‌یەکەی پاساو دراوە •
(٢٥) بەدۆستێکی خۆتی ئەڵێیت لەکاتی لێ‌قەومانیا ، واتە وامەبە ؛ چونکە دوژمنەکانمان پێ‌یان خۆشە •
(٢٦) زۆر جار ماڵات ، بەتایبەتی مەڕ ، لەکاتی بەهاراندا ، هەڵوێسـتەو دژلەوەڕی ئەکات ، بەڕای شوان‌و خاوەن مەڕەکان گوایـا خوێـن گرتوویەتی ! بەم جۆرە تۆزێ لەسەر گوێی مەڕەکە بەچەقۆیەك لەت‌ئەکەن ؛ تا ئەو خوێنە پیس‌و زیادە دەرچێت !
ئەم پەندە بە یەکێکیش ئەوترێ ، کە لە خوت‌و خۆڕایی شەڕ بەم‌و بەو بفرۆشێ ، واتە یان خوێنێك ئەکا ، یان پێویسـتی بەخوێنـاوی کردن‌و لووت چوازانەوەیەك‌هەیە •
(٢٧) واتە بەشتی پڕوپووچەوە خۆی خەریك ئەکات •
(٢٨) واتە بێ‌قسـەنیە ، یان نەخۆشە •

٣٤ـ خێر ،وابەسەرپێی ( گەڕان ) ەوە (٢٩)

٣٥ـ شەڕی بەپای فیله (٣٠)

٣٦ـ خێرو شەڕی بەرامبەرن (٣١)

٣٧ـ خێرەت ( غیرەت ) سەگ بتخوا (٣٢)

٣٨ـ خێری خۆت‌و شەڕی خۆم (٣٣)

٣٩ـ خێل بارەكا ، بلە كەپر ( ئەكا ) (٣٤)

٤٠ـ خێڵی ( پەنابەخوا ) ساڵی دووجار تالان ئەكرێن (٣٥)

---

(٢٩) واتە دانیشتن هیچ سوودێكی‌نیە •

(٣٠) واتە زیان بەخشە • ئەم پەندە بەهەڵە كە وتۆتە ئێرە •

(٣١) واتە چاكەو خراپەی وەك‌یەكن •

(٣٢) یەكێك بەخۆی ، یان یەكێكی‌تر ئەڵێ ، كەبەكارێك نەوێرێ واتە ئیتر خیرەت بۆكەی •

(٣٣) واتە لێم دووركەوەرەوە •

(٣٤) بەیەكێك ئەووترێ ، كە كارێك بكات پێچەوانەی خەڵكی‌بێ •

(٣٥) واتە ئادەمیزاد نابێ لەئیش‌و كاریا تەنها پشت بەخوا ببەستێ‌و هیچی‌تر ، بەڵكو لەگەڵ ئەوەشدا ئەبێ بیرو هۆش‌و دەست‌و بازووو چاوو دڵ‌و ژیریی ، یەكانگیركاو بیانخاتەئیش بۆوە دەست هێنانی ژیانی خۆی‌و ماڵ‌و منال‌و گەل‌و نیشتمانی ، ئەوكاتە خوایشی لێ‌قایل ئەبێ‌و خەڵكیش •

٤١ـ خێڵێ لەسەرئەو ڕەوی کردووەو ئەویش چووە بۆ پووشکە ! (٣٦)

٤٢ـ خوا موڵکی خۆی کاول ناکات (٣٧)

---

(٣٦) ڕەوکردنی خێڵ : بارکردنێکی نهێنی و بەدزی یەوەیە لەشەوا ! بۆ بڕینی ڕێگایەکی دوور لەبەر ڕووداوێك ٠ بەیەکێك ئەوترێ ، کە بایەخێکی هەبێ و خۆی گوێی نەداتێ ٠

(٣٧) واتە بە بەزەیی یە ٠

## پیتی - دال -

١ - داران لەدوور سەریان سەوزە •

٢ - داری ( ژاڵە ) نابێتە شەکەر داری ( کێکف )یش نایەتەبەر •

٣ - داری ( قنگر ) چۆنە ؟

٤ - داری لار ، نەبەئار بار •

---

(١) بەدەوڵەمەنێك ئەوترێ ، کەتەنها ناوبانگیھەبێو هیچی لەدەست نەبێتەوە •

(٢) واتە هەرگیز چاوەڕوانی کردەوەی چاك لە پیاوی خراب مەکە •

(٣) ئەگێرنەوە ، کە ژنێکی هەژار کچێکی ئەبێو زۆر بەهەژاریو کوێرەوەری بەخێوی ئەکات ، لەپاشان ئەیدابەشووو بەپیاوێکی دەوڵەمەنو دەست ڕۆیشتوو ، دوای ماوەیەك کە بەرەو باوان ئەبێتەوە ، دایکی قنگری بۆلێئەنێ ، کەچی کچەکە ئەمپرسیارە لەدایکی ئەکا ! ! •

دایکیشی لەوەڵامدابێی ئەڵێ :-

ڕۆڵەگیان ! یاخوا لاولۆت پاچی !

ئەوەبوو من ئەمکەندو تۆ ئەتقاچی ، واتە زلفت بڕی ئەوەبوو من هەڵم هەکەندو تۆباجو پەلو پۆکەت ئەقرتاند •• بەیەکێك ئەوترێ کە خۆی لێگۆڕابێ •

(٤) واتە لەگەڵ مەردمی خراپ هەرگیزو بەهیچ جۆری تێکەڵمەبە •

٥ ـ داری ووشك بەرناگرێ (١)

٦ ـ دارێ عارو دارێ نەتگ ، باقی زرپو تۆپ ! (٢)

٧ ـ دارێ لەمرخۆرئەدەی ، دارێکیش لەمرکوژبدە (٣)

٨ ـ داش بەداش (٤)

٩ ـداشی سوارە (٥)

١٠ـ دارێ لەسەرسەگەو دارێك لەسەرئەو (٦)

١١ـ داوا بەدەستڕۆیشتنە (٧)

١٢ـ داوای ( ک •• )ی بێمووئەکا (٨)

١٣ـ دایك بگرە ، کچ بەدەست خۆتەوەیە (٩)

---

(١) واتە هیوا لەشتی بێ کەڵك ناخوازرێ •

(٢) زرپو تۆپ : مەبەس لێدانە •

(٣) لە کاتێکا ئەوترێ ، کەبێتاوان ، یان کەم تاوان بە تاوانبار دانرابێ، واتە تاوانباری ڕاستەقینە بناسەو تۆڵەی لێ بکەرەوە ، نەك بێتاوان ، یان کەم تاوان •

(٤) بە دووشت ئەوترێ ، کەبەرامبەر یەکتربن •

(٥) بەیەکێك ئەوترێ ، کە دەستو قسەی بڕوا •

(٦) بەیەکێك ئوترێ ، کە حاڵی زۆر خراپ بێ بەدەست یەکێك یان چەن کەسێکەوە •

(٧) واتە هەمووشتێك بەپارەئەکرێ •

(٨) بەیەکێك ئەوترێ ، کە هەمووشتێکی بەئامادەو پاك کراوی بوێ •

(٩) چونکە باوکی کچەکەش لەقسەی ژنەکەی دەرناچێ ، لەکاتی خوازبێنیدا بە کار ئەهێنرێ •

١٤- دایك بووبەباوەژن ، باوكیش ئەبێ بەباوەپیارە (١٠)
١٥- دایەوەکەندێ (١١)
١٦- دزی‌نەگیراو ، شایە (١٢)
١٧- درۆبێ‌و بافرەبێ (١٣)
١٨- درۆزن‌و پەڕۆزنی یەکترن (١٤)
١٩- درۆزن یەك‌جار ناشتائەخوا (١٥)
٢٠- درەوی‌لێز ، گۆشتی‌گێز ، ژنی‌درێژ • پەسەندن •
٢١- دزمان‌گرت (١٦)
٢٢- دڵم پڕەو دەمم‌کڕە (١٧)

---

(١٠) چونکە پیاوەکەش لەقسەی ژنەکەی دەرناچێ‌و هەردولا بۆ منالەکە خراپ ئەبن •
(١١) لەڕووی سووکی‌یەوە ، بەهەموو شتێکی باونەماو ئەوترێ •
(١٢) چونکە هەرچیەکی دزی‌بێ ، بەشێنەیی ئەیخوا •
(١٣) بەیەکێك ئەوترێ ، کەهەرچی بلێ درۆبێ •
(١٤) پەڕۆزن : ئەوەی درۆپینەئەکات • بەدووکەسی درۆزن ئەوترێ کە یەکێکیان درۆی ئەویتریان پاساودا •
(١٥) ناشتا : ئەو خواردنەیە ، کە بەنوخشە ، یان نۆبەرەی ڕۆن بکرێ ، یان هەربەڕۆن‌و کەرەبکرێ ، وەك چنگاڵ خورماو رۆن‌و هێلکە •• تاد ئەم یۆرە خواردنە تاسقەو بەهەموو کەس نادرێ ، وەئەگەر بەدرۆزنێ بدرێ لەبەرنەناسینی ، جارێکی‌تر دەمی لێی ناکەوێ •
(١٦) بەیەکێك ئەوترێ کەپێی نابێ لە گوناهی خۆی‌و ئاشکرابووبێ •
(١٧) واتە زۆرشت لە دڵمابە ، بەلام ناوێرم ، یان ناتوانم دەریان برم •

٢٣- دنیا بێبەشوژنفرۆش ، خواپەکی کەس ناخا •

٢٤- دنیا توخمی تەماحە •

٢٥- دنیا دەقەن و دوقەنە •

٢٦- دنیا ڕیشەت کنیا •

٢٧- دنیا وەك تاسی حەمامە ، هەرڕۆژەی بەدەست یەکێکەوەیە •

٢٨- دنیا نموونەی قەیامەتە •

٢٩- دنیای بێوەفا کاروانسەرای ڕا نیوەی بەدڵتەنگ ، نیوەی بەدڵشا (١٨)

٣٠- دوژمنت بەهەند بزانە (١٩)

٣١- دۆعا مەکە خۆشەویستان باگیرنەبێ لەنەویسان • خۆشەویتسان •

٣٢- دووگ بێ و دەمی سەگ کەوتبێ •

٣٣- دوو لەئاداری یەك لەنیسانێ چێترە لەموڵکی خۆراسانێ (٢٠)

٣٤- دووپێی بوو ، دوویتری بۆقەرزکرد •

---

(١٨) ڕا : ڕێگە • : دڵشاد • پیرەمێرد ئەڵێ :-

دنیاکەی فانی کاروان سەرای ڕەنگ

نیوەی دڵشادە ، ئەونیوەی دڵتەنگ •

(١٩) واتە بەزۆری بزانە •

(٢٠) واتە ئەگەر لەمانگی ئادار دوو باران و لەنیسانیشدایەکێك ببارێ ، پێزی بەرهەمی کشتوکاڵی ئەوەندەباش و بەبرپیارئەبێ ، لەهەموو موڵکی خۆراسان چاکتر •

٣٥ـ دوانزه مانگه بەڕۆژووه ، کەچی بە (گ ٠٠) بەر بانگ ئەکاتەوە(٢١)
٣٦ـ دۆستی وامان هەبێ ، دوژمنان ناوێ (٢٢)
٣٧ـ دوێته بخوازه ، تازەکەوتوٚته وڵنگەوازه (٢٣) •
٣٨ـ دۆێته لەماڵ تاقی‌کەرەوه ، ئینجا بینێره بۆ گیای کەژ •
٣٩ـ دەردەدار ئاگای لەحاڵی دەردەداره •
٤٠ـ دەستدار (دەزدار) ئەخوازێ بێ‌دەست ئەڕوانێ •
٤١ـ دەستی خۆمانمان لەقاپێکدا نەدیوه (٢٤)
٤٢ـ دەستی ناپەرژێ سەری خۆی بخورێنێ •
٤٣ـ دەستی (وەیسکە)و شوژنی (پیلا) (٢٥)
٤٤ـ دەمی ئەڵێی (چەقەنە)ی ئاشه •
٤٥ـ دەمی زەندووه •
٤٦ـ دیزه ڕەشەی فڵتەلەبن خڵتەکەی خۆت بهەسووەمن •
٤٧ـ دێ نەگەیی ، دێوەرگەیی •
٤٨ـ دێ نەگەیه دێوەر سه گەیه سێوەر •
٤٩ـ دین نەماوەو ئیمانیش هەر هەندە دەکا •

---

(٢١) بەیەکێك ئەوترێ ، کەزۆر کردەوەو قسەی باشی‌هەبێ ، کەچی لەپڕێکا بەشتێکی خراپ هەمووی تێکدا •
(٢٢) بەیەکێك ئەوترێ ، کە بە ناوی دۆستایەتیەوه ، دوژمنایەتی بکات•
(٢٣) دوێت • کچ و لنگەوازه : چاوبڕکێ و هەوەس بازی •
(٢٤) وانه ئەوەندە یەکتریمان نەناسیوه ، بانگ کردنێکی خواردنی یەکتربکەین •
(٢٥) پیلا : پۆڵا •

## پیتی – ڕێ –

١ – ڕووداریٚك لەزۆرداریٚك خراپترە •

٢ – ڕوویەك لەزۆریٚك خراپترە •

٣ – ڕووی خۆمم کردبە ، بەرد •

٤ – ڕووی ڕۆژ لەبنەڕۆ دیارە •

٥ – ڕۆژی بەبێ ناپێوێ •

٦ – ڕۆژی لەجێیەکی خراپدا لێ ئاوابووە •

٧ – ڕەحمەت لەوکەسەی دووکەس ڕێکخاك •

٨ – ڕەش ناخاتە سەر سپی •

٩ – ڕێوی لەبرسانا نەی ئەتوانی بڕوات ، ئەیانووت :
زۆری خواردووە ! •

---

(١) ڕوودار : ئەوکەسەیە کەخۆشت ئـەوێو نازی ئەکێشـیت ، جـا کەداوای شتێکت لێبکا ، ناچاری بیدەیتێ •

(٣) زۆرتر ئافرەتێکی ڕووتەڕو شەرمن ئەیلێ ، کە بە ناچاری داوای دەفرێکی کردبێ •

## پیتی ـ زێ ـ

١ ـ زمان ، ئامان •

٢ ـ زمان لەدەمیا نیــە •

٣ ـ زمانی بەندە ، قەڵەمی خوایە •

٤ ـ زمانی درێژ بەڵای سەرە •

٥ ـ زەرەر لەنیوەی بگەڕێتەوە ، قازانجە •

٦ ـ زۆردار ئەی سێنێ‌و ڕووڕەش ئەیخوا •

٧ ـ زۆری‌و زلۆری •

٨ ـ زەلام بەپشقەڵێك ملی شکاوە •

٩ ـ زۆرشتمان دیوە ، ( ک •• )ی زەنگ لەملمان نەدیوە •

---

(١) پاڕانەوەیە لەزمان ؛ بۆ ئەوەی زێدەڕۆییش بەدگۆیی نەکات •

(٢) واتە کەم دووە •

(٣) لەگەڵ خەڵك باش‌بی ، بەکردارو ووتار ، خواش باشت بۆ ئەکا •

(٨) واتە دەست لەکەس مەوەشێنە ئەگەر دژمن‌و تاوانبارنەبێ •

(٩) بەشتێك ئەڵێن کە لە هەموو نەرێتێ چوبێتە دەرەوە •

١٠- زەماوەنە هەیتوهوتە گۆشتی‌نیە ، شۆربای رووتە ! (١)

١١- زێڕ ، ژەنگ هەڵ ناهێنێ (٢)

١٢- زێڕ ناســە (٣)

---

(١) بەهەموو شتێکی بەهاشــەو هوشــەو درۆو دەلەســەو پڕو پاڵانتــە ئەووترێ کە گوێی خەڵکی کاس کردبێو وەیتریش هیچ •

(٢) واتە ئادەمیزادی مەردو ڕاستگۆ ، هەرگیز بەقسەی ئەمو ئــەو نەنگو لەکەدار نابێ • وەك وتراوە : دەریا بەدەمی سەگ پیس نابێ •

(٣) واتە زیرو پسپۆڕە •

## پیتی – ژێ –

١ – ژن بەتۆران سووك ئەبێ •

٢ – ژن سەگیش پێی ناوەڕێ •

٣ – ژن لەمێرد بسەندرێتەوە ، وەرد لە گا ناسنرێتەوە •

٤ – ژنی خراپ منالّی ڕەسەنی لێناکەوێتەوە •

٥ – ژیانی کولە مەرگی‌یە •

---

(١) واتە ئەو ڕێزو قەدرەی نامێنێ کەلە مالّی مێردیا هەیەتی • زۆرتر ئەو ئافرەتانە بەکاری ئەهێنن کەبچنە شوێن ژنی تۆراودا •

(٢) بەکابرایەکی هیچو پووچو بێ نرخ ئەوترێ ، کە چووبێ بە گژ ئافرەتێکا ، واتە کابرا تۆ لەسەگیش کەمتری •

(٣) واتە چۆن ئەویان نەبووە ، ئەمیشیان نابێ •

(٤) واتە کەدایكو باوك خراپبن ، منالّەکانیشیان وەك خۆیان ئەبن •

(٥) بەژیانێکی ناخۆش ئەوترێ •

## پیتی – سین –

١ – ساڵ ساڵەو ماڵ ماڵە •

٢ – سان جمۆ ( تاران ) مەگیرۆ •

٣ – سوورهات ساتی لەبیزچوو •

٤ – سوڵتان بەئەسڵ •

---

(١) واتە ساڵ هەیە ساردو سڕەو دەغڵو دانو مەڕو ماڵات بێخێرو بێرو بڕەون ، ساڵیش هەیە هاتەو بەخێرو بێرە ، وە هەمـــــوو ماڵێکیش لەو ساڵانەدا وەك یەك نین •

(٢) سان : گەورەی هۆزی هەورامی بووەو زۆر بەهێزو دەسەڵاتدار بووەو هەموو کارێکی لەبەر ڕۆیشتووە •

(٣) بەیەکێك ئەوترێ ، کە بەهۆی شتێکەوە هەموو کاتو بەڵێنێـــکی لەبیر چوبێ •

(٤) بەیەکێك ئەوترێ کە ناکەس بەچەو ناوەجاخ بێو ئیشێکی گەورەشی پێسپێررابێو ڕێزی ڕێزداران نەگرێ •

٥ ـ سوێن بەسەری یەکتری ئەخۆن (١)
٦ ـ سوێن کافر خوارد بێتی (٢)
٧ ـ سەد ئیشی تەوەکەلی ، یەکێکی خراپ ئەبێ (٣)
٨ ـ سەد شوژن گاسنێکی تیانابێ (٤)
٩ ـ سەر بۆسەربڕین ، ماڵ بۆ جەریمە (٥)
١٠ـ سەر بە قوڕین ئەهێنێتە پێ کەنین (٦)
١١ـ سەرسپی ، ناوسك ڕەش (٧)
١٢ـ سەرو پێ یەکی پێ خۆشە ناکرێ (٨)
١٣ـ سەری کەچەڵ هەر لەتوورەکە دابێ ، باشترە (٩)

---

(١) واتە یەکتریان خۆش ئەوێ و ڕێزی یەکتر ئەگرن .
(٢) واتە سوێند ناخۆم .
(٣) ئیشی تەوەکەلی : ئەو ئیشەیە کەبەدڵێکی پاك و نیازێکی خاوێن و بێ زیانی خەڵکی و پشت بەخوا بکرێ ، واتە سەد ئیشی ئا بەم جۆرە ، مەگەر یەکێکی خراپ دەرچێ .
(٤) واتە سەد شتی نیوەچڵ جێی شتێکی پوختەو تەواو ناگرێتەوە .
(٥) یەکێك ئەیلێ کەشەڕو ناهەقیەك یەخە گیری بووبێ و ئەمیش بەرامبەری ڕاوەستابێ .
(٦) واتە گاڵتەچیەو قسەخۆش .
(٧) بەیەکێکی بەدیمەن خاوێن و وەیتریش بوغزاوی و کینە خوازو داخ لەدڵ ئەوتێ .
(٨) واتە هیچی بەدەست نیە .
(٩) واتە هەر قسە ، یان کارێکی ناشیرین و زیان بەخش ، هەر نەوترێ و نەکرێ ، باشترە .

١٤ـ سەری کەرەکە لادەرەوە (١٠)

١٥ـ سەری کۆتیو پێیپەتی (١١)

١٦ـ سەری (نێلە)ت نەکەوێتە زەوی (١٢)

١٧ـ سەرینی پیری ، ماجەرا دیری •

١٨ـ سەرێکە هێناومەو نایگێڕمەوە (١٣)

١٩ـ سەرێکی هەیەو هەزار زمان (١٤)

٢٠ـ سەگ بەپێستەوە ئەخوا (١٥)

٢١ـ سەگ ، کەزمانی گەیشتە برینی خۆی ، چاك ئەبێتەوە (١٦)

---

(١٠) ئەگێرنەوە ، کەپیرەژنێ لەجەژنا سواری کەرێك ئەبێ‌و منالێك هەوساری کەرەکەی بۆ ڕائەکێشێ‌و ماڵەو ماڵ ئەگەڕێ بۆجەژنە پیرۆزەو گەردن ئازایی وەکە خولکی ئەکەن بۆنـان خـواردن ، ئەمیش وابە منالەکە ئەڵێ ، بەیەکێکی زۆر خۆر ئەوتری ، کە بەنەیجە خولکێك سکی خۆی هەڵکێشێ •

(١١) وانە هەژارو دەست کورتە •

(١٢) ئەمە نزای چاکە بووە ، واتە یاخوا گاجوونیەکانت لێیان نەمرێ •

(١٣) یەکێك ئەیلێ کەتە گەرەیەك هاتبێتەڕێی ئیشەکەی‌و نەیەڵـێ بیکا ، واتە واز لەم ئیشە ناهێنم ئەگەر سەریشمی تێدا چوبێت •

(١٤) واتە دووزمانە •

(١٥) واتە زۆر دزە •

(١٦) بەدژمنێك ئەوترێ کەدەستێکی لێ وەشابێ ، بەلام بەفێڵ‌و فڕی خۆی چاری دەردی خۆی کردبێ •

٢٢ـ سەگ گووی ئەخوارد ، کەچی ئەیووت ! خوا ڕزقم ئەدا (١٧)
٢٣ـ سەگی خۆمەو قول ( قاج )ی خۆم ئەگرێ (١٨)
٢٤ـ سەگیشت هەر خۆماڵی بێ ، باشە (١٩)
٢٥ـ سەگێ قنگی ئاشێکی ئەلیسایەوە ، سەگێکی تریش
ئەچوو قنگی ئەوی ئەلیسایەوە ! (٢٠)
٢٦ـ سەگێك لەسەگەل کەم بێتەوە هەرباشە (٢١)
٢٧ـ سیروانی کۆترە دێنێ (٢٢)
٢٨ـ سێمینە حەدیسە (٢٣)

---

(١٧) لەڕووی سوکیەوە ، بەیەکێك ئەوترێ کەژیانێکی ناخۆشی هەبێ و
واش بزانێ کەخۆش ئەژی •
(١٨) بەخزمێکی خۆت ئەڵێیت ، کەهاتبێ بەگژتاو دڵی شکاندبی •
(١٩) یەکێك وا ئەڵێ ، کە بێگانە ستەمێکی لێ کردبێ •
(٢٠) لەڕووی سووکی‌یەوە ، بەیەکێکی بێ‌نرخ ئەوترێ ، کە ئەویش
خۆی بەسووکترێکا هەڵواسیبێ •
(٢١) واتە دژمن تاکەم بێ باشترە •
(٢٢) بەیەکێك ئەوترێ ، کە زۆری برسی بێ •
(٢٣) بەشتێك ئەوترێ ، کەتا سێ‌جار روونەدا ، حساب نەبێ ، یان
بەسێ جار تەواو بێ •

## پیتی - شین -

١ - شا بەخزمەتکار ڕاناگرێ •

٢ - شــا بەگونــی •

٣ - شام شەکرە ، بەڵام نیشتمان شیرینترە •

٤ - شۆ قووربێ ، وەرد هووربێ ، تۆو باڵەژووربێ •

٥ - شەڕ بووبەشەڕ ، ناو بڕی کەر سەری ئەشکێ •

---

(١ ، ٢) واتە باکی بەکەس نیە •

(٣) شام : سوریای ئێستەیە ، دیارە کورد هەر لەکۆنەوە نیشتمانــی خۆی خۆشی ویستووە ، وە لەگەڵ ئەوەشدا ڕقی لــە نیشتمانــی هیچ گەلێکی تر نەبووە ، تەنها کوردستانی لا خۆشە ویستتربوو • لەهەموو شوێنێکی‌تر •

(٤) شۆ : یەکەم گاسنە بۆزەوی کێڵان لەبەهارا بۆ کەژی داهاتوو •
قووربێ : قووڵبێ ، گاسن زۆر داکەوێ •
هووربێ : وورردبێ ، هێڵەکان پاڵ بدەن بەیەکەوە •

(٥) چونکە هەرکام لەشــەڕکەرەکان دابێنــەوە بۆیەکــتری ، ئــەم بەرەکەوێ •

٦ ـ شەرع جەوەڵ جەوەڵە (١)
٧ ـ شەرع زایەر بینە (٢)
٨ ـ شەرع شەرمی بڕیوە | (٣)
٩ ـ شەرع شەرمی بۆنیە |
١٠ـ شەڕ لەشەڕگە خۆشە (٤)
١١ـ شەڕێکە ، کلکی کەری کوڵی تیا ئەبڕ ڕێ (٥)
١٢ـ شەریکیو تەریکی (٦)
١٣ـ شەل بەشاتاغە ، کوێر بەهەڵمەتە بەدەماغە (٧)
١٤ـ شەل بەشاکەتە ، کوێر بەهەڵمەتە (٨)

---

(١) واتە دوورو قووڵەو لێکدانەوەی مامۆستای زاناو شارەزای ئەوێ ؛ بۆیە زۆر جار بۆڕوون کردنەوەی بابەتێکی شەرع ، یان گیرو گرفتێکی کۆمەلایەتی ، پەنا ئەبرێتە لای زیاد لە مامۆستایەك •
(٢) واتە ئەبێ ئیسبات بێ •
(٣) واتە شەرع ویاسا ، ئەگەر خوارنەکرێنەوە ، بڕیاری خۆیان ئەدەن بەسەرتاوا نیاردا ، ئیتر هەژاربێ ، یان دەوڵەمەن ، کەسدار بێ یان بێکەس ، ژنبێ یان پیاو •••
(٤) واتە هەموو شتێ لەکاتەو شوێنی خۆیا خۆشە •
(٥) لەڕووی لاقرتیەوە ، بەشەڕو ئاژاوەی چەنکەسێکی بێنرخ ئەوترێ •
(٦) واتە شەریکی قازانجی نیە •
(٧) شاتاغ : تەڕو جوان پۆش • واتە یەکەمیان جوان پۆ شەو دووەمیشیان بەبیرو هۆشو ژیریی •
(٨) واتە یەکەم لەڕۆیشتنا زووتر ماندوو ئەبێ لەدووەم •

١٥- شەل بەشەوکەتە ، کوێر بەهەڵمەتە •

١٦- شەیتان فەخری کردبێ (٩)

١٧- شەیتان وەسپی خۆی داوەتەوە

١٨- شیرین ژنبوو یان پیاو ؟! (١٠)

١٩- شینو شایی بەدەستەوام (١١)

٢٠- شێت ئەبرێ بۆ ( ئۆمەرمەندان ) بۆ چاكبوونەوە ، ئەی ئەگەر ئۆمەرمەندان شێتبێ ئەبرێتە کوێ ؟ (١٢)

٢١- شەڕوتڕ ئاوا یەقەی پیاو ئەگرێ (١٣)

٢٢- شێرە ڕەشی حەوکولێرە خۆرە (١٤)

٢٣- شمشاڵ بەبرای بێ‌لێو لێ‌دەدەن (١٥)

---

(٩) واتە خۆت بە زل مەزانە ؛ چونکە پیشەی شەیتانە •

(١٠) بەیەکێك ئەوترێ ، کەماوەیەك باسی شتێکی بۆ بکەی ، لە پاشان لێی تێ‌نەگاو تەقەی سەری بێ •

(١١) واتە هەردوکیان پێویستیان بەیارمەتی دانە •

(١٢) ئۆمەر مەندان : شەخس ( چاك )ە ، بەگەورەو زانایەك ئەوترێ کەلێی قەومابێ •

(١٣) یەکێك ئەیلێ ، کەشەڕێکی بۆ تاوا بێتەوەو ، ئاگایشی لـێی نەبێ •

(١٤) بەزۆر خۆر ئەوترێ •

(١٥) واتە ئێش بەنەزان مەسپێرە •

## پیتی – عەین –

١ ـ عقڵ تاجی زێرینە ، بەڵام لەسەر هەموو کەسێکدا نیە .
٢ ـ عقڵ هەمموو جارێ میوان نابێ .
٣ ـ عقڵی ئەوسام ئێستە بوایە .
٤ ـ عەنتەرو وەکیلیان نەووتووە .

---

(١) بۆیە قیرە مێردیش ئەڵێ :ـ
عەقڵ تاجێکە لە نووری یەزدان
بیکەرە سەرت بڕۆ بۆ ئاسمان .
(٢ ، ٣) یەکێك ئەیلێ کەبەهۆی لێك نەدانەوەو بـــیر نەکردنەوەوە ، هەلێــکی لەدەست چووبێ .
(٤) ئەگێڕنەوە ، کەجارێکیان عەنتەرێك ئەکەن بەوەکیلو دەم ڕاست ( حەکەم ) ؛ بۆ بەش کردنی دوو سەلك پەنـیر ، کەیەکێـکیان لەوی تریان قورستر ئەبێ ، ئەمیش تەرازوویەك دێنێو ئەیانخاتـە هەردو تاکەیـەوەو قەپاڵێـکی وا ئەگـرێ لەقورسـەکەیان ، کـە کەلەسووکەکە ، سوکتری ئەکا ! ئینجا قەپاڵێك لەمیشیان ئەگرێ کە ئەمیش سووکتر ئەکاتەوە بەم جۆرە قەپاڵێك لەمیانو یەکێـك لەویان ، تاهەردوکیان ئەخوا ! بەیەکێك ئەوترێ ، کەکارێـــکی پێسپێررابێو ناپاکی تیا بکاو هەر بۆ خۆی رایکێشێ .

## ٥ ـ عەیب عەبایە (١)

(١) ئەم پەندە هەر چەند لەکوردیا بەکار ئەهێنرێ ، بەڵام لەعەرەبیەوە نزیکترە ، چونکە :ـ

١ ـ پیتی (عەین) پیتێکی عەرەبیەو لەکوردیدا بەکار ناهێنرێ ( مەگەر بە دەگمەن ) •

٢ ـ هەر دوو وشەی پەندەکە ( عەیب و عەبایە ) عەرەبین •

٣ ـ عەبا لەسەرەتاوە ، لەکوردەواریدا بەکار نەهێنراوە ، تەنها مەگەر لەشارەکاندا هەبوو بێت ، وەتا وەکو ئێستەش ئافرەتانی لادێ و خێڵەکیەکان مەگەر لەکاتی دابەزینا بۆ شارەکان بەکاری بێنن •

٤ ـ وەکە بڵاویش بۆتەوە ، شاعیرانمان بەرەنگاری بەکارهێنانیان کردوەو جلی کوردی ئافرەتانمانیان بەلاوە جوانبووە • بۆ نموونە شاعیرمان ( شیخ نووری شێخ سالح ) بۆ لابردن و فرێدانی عەبا بە ئافرەتانی کوردمان ئەڵێ : ـ

فرێیدە لایە توخوا بیخەناو تەنوورەوە

حەیفە ڕۆژی ڕوون بخەیتە ناو شەوی دەیجوورەوە•

( ڕەسافی )ش بە ئافرەتانی عەرەب ئەڵێ : ـ

اسفري ، فالحجاب يا ابنة فهر

هو داء في الاجتماع وخيم ••• تاد

واتە بێ عەبابن ، ئەی کچ ، یان ئافرەتانی عەرەب ؛ چونکە

٦ ـ عەیبی تۆ جلێ لەبانی هی من دنیا پێی زانی (٢)

٧ ـ عەیبی هەر بەسەزمانیە

٨ ـ عینوانی لەقەد ( قـ •• )ی نیە

٩ ـ عەلەیکە سەلام ، ئەی بۆرە زەلام ! (٣)

---

پەردەو عەبا نەخۆشی‌یەکە ، کە باڵی تاریکی بەسەر کۆمەڵدا کێشاوە • بەیەکێك ئەوترێ ، کە بەهۆی ڕووکەشێکەوە ، چەن کەم کوڕی ونەنگێکی خۆی شار دبێتەوە ، یان تۆ کارێك بکەی‌و بڵێ : مەیکە شوورەیە •

(٢) بەیەکێکی نەنگداری ئەڵێت ، کە نەنگی خۆی باس نەکاو نەنگداریشت بکا • شاعیر ئەڵێ :

خەڵك خاوەنی عەیبێکە تۆ خاوەنی هەزاری
خەڵکت لەلا خەرارە ، خۆیشت وەکو دەواری •

(٣) واتە زۆر نەزانە •

## پیتی - فێ -

١ ـ فاسۆن بۆ ( گیانه ) باشه •
٢ ـ فرەخۆری کەم هەڵمەته •
٣ ـ فەخر ناچێته قەبر •
٤ ـ فەڕ وابه بارینەوە •
٥ ـ فەلاح ڕەنجی بۆخۆیەتی
دەرەبەگ باوکەڕۆیەتی
٦ ـ فێرکەران ، فێریان مەکە
کەفێریان کەی ، تێریان مەکە •

---

(١) گیانه : ناوی پیاوێك بووه ، که ژنەکەی ئەم داوایه بۆ کردووه، واته هەموو کەس ئارەزووی شتی باش بۆ دڵسۆزی خۆی ئەکات•
(٢) بەزۆر خۆرێکی دەبەنگ ئەووترێ •
(٣) واته ئازاری خۆ بەزل زانینو گاڵتـه بەخەڵـك کردنت ئەچێژی بەر لەوەی بمری •
(٤) واته باران نەبێ ، کشتوکاڵو دەغڵو دانیش نابێو گرانی ڕوو ئەدا ( وفي السماء رزقکم وما توعدون ) •
(٦) فێرکەران : فێرکراوان • چونکه وازت لێ نایەنن •

## پیتی ـ قاف ـ

١ ـ قاڕەکەر لەدەرماڵت برێ ٠

٢ ـ قسمەت و نسیب بردمیە جاێ
پەلەور وەباڵ وەلاما نایێ ٠

٣ ـ قسەتێ قسە ئەبڕێ ٠

٤ ـ قسەی خۆش بەرد نەرم ئەکا

٥ ـ قسەی خۆش کوێستانی ( کـ ٠٠ )ە !

٦ ـ قسەی خۆش لەبەهەشتەوە هاتووە ٠

٧ ـ قسەی خۆمان لەبیری خۆمان ٠

---

(١) قاڕەکەر : مەبەس بزن و مەڕە ٠ دیارە کاتێ ئەم پەندە ووتراوە، تەنها ئاژەڵدار بەساماندار دانراوە ٠

(٢) جا : جێگە ٠ یەکێك ئەیڵێ لەکەس و کاری دووربێ ٠

(٣) لەکاتی قسەکردنا ئەووترێ ، کە قسەیەکی تر بەبیرا بێ و لـــەم لادەی ٠

(٤) واتە هەمیشە قسەت خۆش بێ ؛ چونکە بەتوڕەیی هیچ کارێـك ئەنجام نادرێ ٠

٨ ـ قورئان خۆر تڕی حساب گەری بڕی (١)

٩ ـ قورئان لەبەینداپێ (٢)

١٠ـ قورئان نەوەهەق ، نەوە ناهەق (٣)

١١ـ قوڕقوشمی کرد بەقوڕگیا (٤)

١٢ـ قۆناغی ناخۆشی ماڵی خۆیانە (٥)

١٣ـ قەرەوڵیان لەیەك ئەگەڕێتەوە (٦)

١٤ـ قەزا بەقیسپ ئەگەڕێ (٧)

---

(١) واتە کەقورئان خورا لەسەر ماڵی دزراو ، یان هەرشتێکی تر ، ئیتر خاوەنی ماڵەکەو حساب گەرو (ڕەماڵ)یش قسەیان ئەبڕێو دەمیان ئەبێتە تەڵەی تەقیو •

(٢) لەکاتی ناوبردنو کارەساتو شەڕو ئاشووبەیەکدا ئەوترێ ، واتە خوا لایدەوی •

(٣) لەبەر پیرۆزیو گەورەییو سامناکی قورئانە •

(٤) واتە تەزاندیو تۆڵەی خۆی لێ کردەوە •

(٥) واتە زۆر ئەگەڕێ •

(٦) واتە بۆ کوشتنی یەکتر ئەگەڕین •

(٧) واتە هەموو شتێك لە بچوکەوە ، گەورە ئەبێ •

١٥ـ قەڵو بەچکە قەلەکەیە (٨)
١٦ـ قەلە ڕەشی دوای گورگە (٩)
١٧ـ قەور قووڵە (١٠)
١٨ـ قنگ ناداتە ژێر پێی خۆی ! (١١)
١٩ـ قین دووماڵ وێران ئەکا (١٢)
(٢٠) قینیشت هەڵسێ ، باروت خۆش بێ (١٣)

---

(٨) ئەگێڕنەوە ، کە جارێك قەلەڕەشێك ئامۆژگاری بەچکەکانی ئەکات و ئەڵێ : ئەگەر یەکێك بەرەوڕووتان هات و دانەوی‌یەوە بۆ زەوی، ئەوە بەردتان بۆ هەڵەگرێ ، زوو هەڵفڕن و جێگەکەتان بەجـێ بێڵن ، کەچی یەکێ لە بەچکەکانی ئەڵێ : ئەی ئەگەر زووتر بەروەکەی هەڵ گرتبێ !؟
( ئەمەیە وتراوە : عەقڵ بەگەورەو بچوکی نیە ) شێخ محمدی خاڵ بەیەکێ ئەوترێ ، کە ئامۆژگاری لە خۆی ژیرتری بکا •
(٩) بەیەکێکی خراپ ئەوترێ ، کەهەمیشە بەدوای خراپترێکەوە بێ •
(١٠) یەکێك لە کاتێکا ئەیڵێ ، کەپرسیاری ڕاستی شتێکی لێ بکەن ؛ واتە چونکە مردن هەیە •
(١١) واتە زۆر ئەگەڕێ و دانیشتنی بۆ نیە •
(١٢) واتە بۆ ڕق هەڵسێن و ڕق هەڵساو ، زیانە •
(١٣) چونکە ، کەڕووت خۆش بێ ، لێت دوور ناکەونەوەو دەستت لێ ناشۆن و هیوایەکیان هەر پێت ئەمێنێ •

## پیتی ـ کاف ـ

١ ـ کارکردن عیادەتە •
٢ ـ کارو گوێر بەکەس نەبن فێر •
٣ ـ کاری مەردان ( مەیدان) سێجاری‌یە •
٤ ـ کارێکی پێکرد ، با بەدەواری دۆمی نەکردبێ •
٥ ـ کا لەخۆو جۆ لەخۆ •
٦ ـ کچم بەخێوکرد کوڕی خەڵك بردی ، کوڕم بەخێو کرد کچی خەڵك بردی •

---

(١) دیارە کورد هەر لەکۆنەوە ئیش‌کردنی پێخۆش بووە ؛ بۆیە لەگەڵ خواپەرستیا ناوی بردووە • شاعیرانیشمان لەمڕووەوە بایەخی باشیان داوە بەئیش‌کردن ، مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس ئەڵێ :ـ عەمەل بۆ بەدەن دەفعی بەڵایە بەدەنی کاسب وەکو پۆڵایە •
(٢) چونکە ، کەفێربوون ، واز ناهێنن •
(٣) واتە پیاوی مەرد ، تا سێ جار چاو پۆشی لەهەڵەی خەڵـــکی ئـــەکات •
(٤) دۆم ، لەبەر هەژاری دەواریشیان سووکە لە بووە •
(٥) بەشتێك ئەووترێ ، کە هەمووی هەر لەخۆی دەرچێ •
(٦) ئەمە هەر وابووەو هەرواش ئەبێ •

٧ ـ کراس تاکۆن بێ ئاڵۆشی زیاتر ئەبێ (١)

٨ ـ کردەی منەو بردەی شەماڵ (٢)

٩ ـ کرێچی ، ماڵی بەکۆڵیەوەیە (٣)

١٠ـ کڵاوی کەچەڵی فڕێ داوە (٤)

١١ـ کوڕ بێ کڵاوزۆرە (٥)

١٢ـ کوربە ، چربەی لەشوێنە (٦)

١٣ـ کوتەکی لێ ناوەتەئاو (٧)

١٤ـ کوڕی ئازا بەسەر ئاوەوە ، ئاگر ئەکاتەوە (٨)

---

(١) بەکەسانێکی بەسالآچوو ئەڵێن ، کە دڵی ئارەزووی لاوێتیان هەرمابێ . لەمڕووەوە هەڵبەستێکی فۆلکلۆری هەیە کەئەڵێ :ـ

من پیر ، ئەوپیر دڵ پیرنابێ
دەستم لەیەقەی گیر نابێ !

(٢) واتە دەستکەوتم بێ پێتە .

(٣) ئەم پەندە زۆرتازەیە ؟ چونکە گیرو گرفتی خانووبەرەو نیشتەجێ کردن تەنگێ چەڵەمەیەکی گەورەیەو خاوەن خانوو هەر ڕۆژەی بەزمێك بەکرێچیانی هەژارێەکا .

(٤) واتە خۆی ڕزگار کردووەو باکی نەماوە .

(٥) شتی گرنگ لەبەرشتی ئاسانو کەم بایەخ پەکی ناکەوێ .

(٦) واتە سەرپێی دامەنیشە .

(٧) واتە هەڕەشە ئەکاو خۆی ئامادەکردوە بۆ شەڕو لێدانێك .

(٨) واتە هەموو ئیشێك بەدەستی ئاسانەو باکی پێ ی نیە .

١٥ـ کوڕی خۆم‌و نان خۆری خەڵکی (٩)
١٦ـ کوڵك‌و موو شی ئەکاتەوە (١٠)
١٧ـ کوڵە ، وەڕینت چی‌و تڕینت‌چی ؟ (١١)
١٨ـ کۆیاتی‌و خۆیاتی (١٢)
١٩ـ کفنی زەردکرد (١٣)
٢٠ـ کۆسە کۆسەیە (١٤)

---

(٩) هەژارێك ووتویەتی ، کە کوڕەکەی شوان‌و گاوانی خەڵك بووبێ •

(١٠) بەیەکێك ئەوترێ ، کەدرێژ ەبەقسەی پڕوپووچ‌و بێ‌سوود بدا•

(١١) بەیەکێك ئەوترێ ، کەچاکیش بڵێ‌و خراپیش •

(١٢) لەناوچەی ( کۆیە ) و تراوە ، واتەپیاو ئەبێ لەپێش هەموو کەسێکەوە ، ئاگای لە خزم‌و برادەری خۆیەوە بێت تا ئەگاتە هاونیشتمانی •

(١٣) واتە زۆرترسا •

(١٤) زۆر فڕوفێڵ‌و تەڵەکەبازی لەکۆسەوە ، ئەگێڕرێنەوە لەوانە : ئەگێرنەوە ، کەبێوەژنێك ئەبێت ، مانگایەك‌و تاقەکوڕێکی ئەبێت ، زۆر هەژارو دەست کورتیش ئەبن ، ڕۆژێ بەکوڕەکەی ئەڵێ : کوڕم سبەینێ مانگاکە بەرەبۆشارو بیفرۆشەو بەپارەکەی کەل‌و پەل‌و پێویستی ماڵ‌بکڕەو زوو وەرەوە • کوڕەش بۆ سبەینێ زوو مانگاکە ئەداتەپێش خۆی‌و بەرەوشار ئەکەوێتەڕێ ، وەکەئەگاتە قەراخی شار ، تووشی‌ئەبێ بە تووش چەن کۆسەیەکی جامبازەوە ( جا ، خۆشاریی ئەوسایش ، خوا بێ چاوانیان کا ، هەر ئەوەنە باش‌بوو کە

لادێی‌یەکیان دەست‌کەوتایێ ، ئیتر بەهەق‌و ناهەق ! کارێکیان پێ ئەکرد ، لادێی‌ی هەژار ناوی خۆیشی لەبیر ئەچووەوەو دەوری لێ چەواشەئەبوو ، ئەی‌کابرای لادێیش ، هەر خۆی واتەنی ، خۆدەم نانێتە دەم ئەو هەرچی‌و پەرچی یانە ! ) .

وەکە دەست ئەکرێ بەسەوداو مامەڵەی مانگابۆر ، ئیتر دەست ئەکرێ بەتیرو توانج‌دان لەکوڕەو مانگاکەی ، بەم جۆرە یەکێ ئەنەوێتە کلکی مانگاو ڕای‌ئەکێشێ‌و ئەڵێ :

ئەم مانگا لاتەبەچەنگ ؟ ! یەکێکی تریان ئەنەوێتە گوێچکەی‌و ئەڵێ : کوڕم ئەم گوێرەکە بەچەنگ ؟ ! .

وەیەکێکی تریان ئەڵێ : هەتیو ئەم نێونە توڕاڵە بەچەنگ ؟! .

بەم شێوەیە ، کوڕەی هەژار هەر خواخوایەتی ڕزگاری‌بێ لەدەستیان و بەسەلامەتی بگەڕێتەوە ! لە ئەنجامدا سەری لێ‌ئەشێوێنن‌و بەپارەیەکی کەم مانگاکەی لێ‌ئەسێنن ، وەکەئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە ، کارەساتەکە وورد وورد بۆدایکی ئەگێڕێتەوە ، دایکیشی زۆری پێ‌ناخۆش‌ئەبێ‌و تۆزی بیری لێ‌ئەکاتەوەو بەکوڕەکەی ئەڵێ : کوڕم خەمت‌نەبێ‌و بڕۆ بەلای ئیشی خۆتەوەو لێی گەڕێ بۆمن .

بێوەژنەکە دێنێت دەستێ جلی جوان لەبەرئەکا ، مێزەرێکی قنج‌و فیت ئەپێچێتەوە ، سمڵ‌و مێخەك‌و گوڵە باخێکی زۆرئەدا لەیەقەی‌و سێ‌میلەی چاوی ئەکێشێ ، بە جۆرێ ، کەدڵێ سەد دڵ حەیرانی‌ئەبێ ! وەبەرەو شار ئەکەوێتەڕێ بۆ تۆڵە سەندن ، کە ئەگاتە شار ، مەیدانەکە ئەدۆزێتەوەو کۆسەکان ئەبینێ‌و خۆی

..........................................................

پێشانیان ئەداو یەکدوو جاریش دەستیان لێ هەڵەتەکێنێ ، ئەوانیش شوێنی ئەکەونو ئەیانهێنێتەوە بۆماڵەوە ، کەئەگەنە ماڵی بێوەژن، خانووەکەی دوورو دووری ئەبێ ، تاقێکی گەورە لە دیوارە ناو کێشەکەی هەردوو ژوورەکەدا ئەبێ ، پێیان ئەڵێ :ـ

جارێ فەرموونە دیوەخان دانیشن ، تا نانتان بۆ حازر ئەکەم ، جادوایی دەست ئەکەین بەبەزمو ڕابواردن ! ! •

بێوەژنیش ، توومەز لەولاوە چەقۆیەکی تیژی ئامادەکردوە ! بەیەکێ لە کۆسەکان ئەڵێ : ئا دەمت بێنە ئەمدیوەو ماچێك بکە ! !•

کۆسەیش بەپەلەپەل سەری خۆی ئەکا بەتاقەکەداو بێوەژنیش ( ناکا بە نامەردی ! ) چەقۆیەك ئەکا بەلووتیاو هەڵی ئەدڕێ ! بەڵام کۆسە هیچ بەسەر خۆیا ناهێنێو توند دەمو لووتی خۆی ئەگرێو ئەڵێ :ـ ئای لە بۆنی ئەوسمڵو مێخەکە چۆن کاری لێ کردمو دای لەسەرم ! ! وەخێرا پشت لەمان ئەکاو ئەچێتە قوژبنێکی (دیوەخان) کورپەئەکات ! ئینجابێوەژنە بانگی کۆسەی دووەمیش ئەکاو ئەمیش لەوی تر خێراتر سەری خۆی ئەباتە ئەو دیوەو بۆنی سمڵو مێخەکەکە گێژی ئەکا ! ! •

بەم جۆرە بێوەژن لووتی هەموویان هەڵەدڕێو تۆڵەی خویان لێ ئەکاتەوە •

بەیەکێك ئەووترێ ( یانچەن کەسێك ) کە بەفڕو فێڵو تەڵەکە بازی سەر لەخەڵکی بشێوێننو دەوری لێ چەواشە بکەن •

٢١ـ کوێت ، تابێ تێت (١٥)
٢٢ـ کەر بباتە سەرکانی ، کورتانی ئەهێنێتەوە بەشانی (١٦)
٢٣ـ کەر بەکەردە ، خرمە خرمی زێدە (١٧ )
٢٤ـ کەرێ لەکن کەرێ بەستیەوە ، یان خەسرەتی
دەگرێ یان ڕەنــگی ( دەگرێ ) (١٨)
٢٥ـ کەری نێرەو بەرەخا (١٩)
٢٦ـ کەرە کەوەی کەرگەل بەگورگ دەرە (٢٠)
٢٧ـ کەری چاك ئەکەوێتە دەست گڵفرۆش (٢١)

---

(١٥) کوێت : ڕەنگی چارەوێ ( ئەسپو ماین )ە ، واتە سوورتاڵەیەکی بێنیشان • تێت : دێت • واتە ئەم جۆرە ڕەنگانــە زۆر ئــەرۆنو درەنگ پەکیان ئەکەوێ •

(١٦) بەرۆژێکی زۆر ساردی زستان ئەوترێ •

(١٧) بەیەکێك ئەوترێ ، کە لە جێی یەکێکیتر دانرابێ ، بەڵام لەو خراپتربێ •

(١٨) خەسرەت : خوو : بەدووکەس ئەوترێ ، کەچووبنــە خــووی ـ یەکتری •

(١٩) واتە بەئارەزووی خۆی ئیش ئەکات •

(٢٠) بەیەکێك ئەوترێ کەسەری زۆرکەسی نابێتەچاڵ •

(٢١) گڵ : مەبەس گڵەسەرە ، کەجاران لەباتی سابوون گڵەسەرو سپۆنو خڕنووك بەکار هێنراوە ، بە شتێکی باشــ ، یان ماڵێــکی بــەنرخ ئەووترێ ، کەدەست گێلۆکەیەك کەوتبێو نــرخو مافی خــۆی نەدابێ •

٢٨ـ کەری کەوتوو ، باری نیە (٢٢)

٢٩ـ کەس بەگلەیی نەمردووە (٢٣)

٣٠ـ کەس خوێ ناکاتە زامی کەس (٢٤)

٣١ـ کەس لەسکی دایکی نەیهێناوە (٢٥)

٣٢ـ کەس لەلاشەی ساغ نانالێنێ (٢٦)

٣٣ـ کەس نیە ، ئەو شای کەسانە (٢٧)

٣٤ـ کەس نالێ : پشتی چاوت برۆیە (٢٨)

٣٥ـ کەسی خۆم دەسی خۆم (٢٩)

٣٦ـ کەسی من دەسی من (٣٠)

---

(٢٢) بێهێزو توانایی ئەگەیەنێ •

(٢٣) ئەگەر دەست ڕۆیشت ، تۆڵە لەزۆردار وەرگرەوە ، نەك بەگلەیی و بناشت ، چونکە گلەیی هیچ لە ستەمەکەی کەمناکاتەوە •

(٢٤) واتە ئادەمیزاد هەرخۆی بەکەڵکی خۆی دێ •

(٢٥) واتە لەتاقی کردنەوەو ئیش کردن ، زانین وەدەست ئەهێنرێ •

(٢٦) نەخۆشێ ئەیلێ ، کەخەڵك باوەڕ بەنەخۆشیەکەی نەکەن •

(٢٧) واتە بێکەڵك جێی کەڵکداری گرتۆتەوە •

(٢٨) واتە کەس ناتوانێ ڕەخنەی لێبگرێ ، یان بۆڵەی بکا •

(٢٩و٣٠) بێجگە لەخۆت کەس بەکەڵکت نایێ •

٣٧ـ کەس ( وشی )شی لەدوو ناکا (٣١)

٣٨ـ کەشکێن پێکەوە ناکوڵێ (٣٢)

٣٩ـ کەڵێکی نەگرتووە ، پاش کەڵ بکاتەوە (٣٣)

٤٠ـ کەمخۆری ڕەنگ‌وڕووە ، زۆرخۆری گەن‌وگووە (٣٤)

٤١ـ کەوتن قەیناکا ، هەڵسانەوەی شەرتە (٣٥)

---

(٣١) وشی : گوڵچنی ، یان گوڵەوەچنیە • دوو : دوا ، شوێن • واتە ، یان ئەوەنە جاڕی پاکە ، هیچ کەس کەڵکی لێوەرناگرێ کەگوڵی تیابدۆزێتەوە ، یان ئەوەندە چرووک‌و دەست نووقاوە ، فلسێ بەکەس نادا •

(٣٢) واتەپێکەوە ناگونجێن •

(٣٣) واتە کارێکی وای پێ‌کرا ، کەجارێکی‌تر ڕووی‌نەبێ بچێتەوە بەوشوێنەدا ، بەیەکێك ئەوترێ ، کەڕیسواکرابێ •

(٣٤) واتە زێدەخۆری مەکە •

(٣٥) واتە هیوا بەرمەدەو دەست لەژیان مەشۆ لەکاتی لێقەوماندا کامەرانی شاعیر ئەڵێ :ـ

لە خۆبایی بوون لەسەرکەوتنا
یا نائومێدی لەژێر کەوتنا
لەناو دڵێکا پەروەردە ئەبن
نەزانێ مانای ژیان‌و مردن

٤٢ـ کەوەخنکێ (٣٦)

٤٣ـ کەوچکەکە بدەمن‌و خۆت بەدەست بخۆ ! (٣٧)

٤٤ـ کەوە ، خـــڕ (٣٨)

٤٥ـ کێ ئەیکاو کێ ئەیخوا (٣٩)

٤٦ـ کێ کەربێ ، فلاّن کورتانە ! (٤٠)

---

(٣٦) واتە ئاو نیە •

(٣٧) واتە داوا لەشتی‌یەکێ مەکە ، کە خۆی پێویستی پێ‌ی بێ •

(٣٨) کەوە : ڕەنگی ئەسپ‌و ماینە ، شینێکی سپی‌باو ، کەلەناوخڕ (بەست) دا ، ناڕوات ، یان زووبەکی ئەکەوێ •

(٣٩) بەکارێك ئەووترێ ، کەیەکێك پێ‌ی هەڵسابێ‌و ئەنجامی هێنابێ ، بەلاّم یەکێکی‌تر لێ‌ی بەهرەو سودمەن بووبێ •

(٤٠) بەیەکێك ئەوترێ ، کە لەگەڵ بەرژەوەندی خۆیابێ‌و بیر لە چاك‌و خراپ نەکاتەوە •

# پیتی ـ گاف ـ

١ ـ گا بەکلك ئەگرێ •

٢ ـ گامێش وەك سمۆرە ناچێ بەدارا
سمۆرە وەك سوالْکەر ناگەڕێ بەشارا •

ـ گولاْلە سووره دەشتێ داگرێ
لەدوور سەیرکردن کەڵکێ ناگرێ •

٤ ـ گونی والە مشتیا •

٥ ـ گڕی کردە بەشەکەی خۆی •

٦ ـ گۆران خاسە ، شێرگۆران خراوە •

---

(١) واتە ناشی‌یە •

(٢) واتە هەر کەس بەئیش‌و کارو ڕێ‌و جێی خۆی •

(٣) واتە هەموو شتێك هەوڵ‌و تێکۆشانێکی ئەوێ ، نەك دەسەوسان‌و سەیر کردن •

(٤) واتە شتێکی لەلایەتی •

(٥) بەیەکێك ئەوترێ ، کەلەپڕێکا قسەیەکی ناخۆش بکات •

(٦) گۆران : کۆچەرە زوو جێ‌گیرو دێ‌نشینەکانن ، بەلاْم شێر گۆران تازە جێ‌و دێ نشینەکانیانن ، وەباش لەکشتوکاڵ‌و خانوو بەرە نازانن ، واتە یەکەم فێری بوو ، بەلاْم دووەم فێرنەبووە ، بەدووشت ئەوترێ کەیەکێکیان لەوی‌تر باشتربێ •

٧ ـ گۆشتی گا بەئاسانی ناکوڵی (١)

٨ ـ گۆشم کەو بەفر پۆشم کە (٢)

٩ ـ گۆشم کەو جل‌پۆشم کە (٣)

١٠ـ گوێرەکەی زۆرخاوەن گورگ ئەیخوا (٤)

١١ـ گوێرەکەی فەقیر هی‌دەوڵەمەنی بەستەوە (٥)

---

(١) واتە کاری‌گران بەئاسانی ناکرێ •

(٢) بەرخ ووتویەتی •

(٣) کار ووتویەتی ، وەهەر دوکیان (٢ ، ٣) بەو واتەیە دێن کەسێك تێری سەری هەموویەتی •

(٤) چونکە هەریەکە لەبەر ئەویتر گوێی ناداتێ •

(٥) لەکاتێکا بەکار ئەهێنرێ ، کەدەوڵەمەنێك لەهەژارێکەوە تەمـــێ خوار بـــووبێ •

## پیتی - لام -

١ ـ لاشە ئەچێتە جێیەك ، كرم‌ومار ئەیخوا .

٢ ـ لڕو ڕاویان نەووتووە .

٣ ـ لۆچ لەناو چاویا نیە .

٤ ـ لێم‌بوو بە شملی شەڕ .

٥ ـ لێم دەربەڕی‌و لێم هەڵ پەڕی .

٦ ـ لێم عایەنە ، جێم‌كایەنە .

---

(١) بەدەبەنگێك ئەوترێ كەلاشەی خۆی خۆش بوێ‌و ئیش نەكات واتە ئەم لاشەی كەتۆ خۆشت ئەوێ‌ڕ نای خەیتەكار ، سبەی ئەمرێت‌و ئەبێتە خۆراكی كرم‌و مار .

(٢) چونكە شوێنەكەیان شاخاوی‌یە .

(٣) واتە بێ‌شەرمەو ڕوو هەڵماڵراو .

(٤) بەیەكێكی نالەبارو خراپ ئەوترێ كەئیشێكی لێ‌تێك‌دابێ .

(٥) بەمناڵێك ئەوترێ ، كەلەڕووی دایك‌و باوكیا وەستابێ .

(٦) واتە باشە ڕۆژی خۆم ئەزانم كە خراپەو ڕزگار نابم .

٧ ـ لەبخۆر مەترسە ، لەنەخۆر بترسە (١)

٨ ـ لەبنی هەمانەکەی‌دا (٢)

٩ ـ لەبەختانمە هەر ئەبێ وابێ (٣)

١٠ـ لەپاش تالاّن گونم مەگیرۆ ؟ (٤)

١١ـ لەپشتی حوشتر بکەوی ، هەڵناسیتەوە (٥)

١٢ـ لەپیاوی نامەرد بترسە ، نەك لەهی مەرد (٦)

١٣ـ لەتڕی لۆتی سازترە (٧)

١٤ـ لەتۆ هەرەکەت ، لەخوا بەرەکەت (٨)

---

(١) بەیەکێك ئەوترێ کەلەپێشدا بەخوڵك‌و خۆ نانی پێ بخۆن‌و دوایش کۆڵ نەدا •

(٢) واتە هەموو شتێکی ووت‌و هەموو نهێنیەکی درکاند •

(٣) یەکێك ئەیڵێ ، کە بۆ هەر کوێ بچێ هەر باسی قسەی پێوەندی داربەوەوە بکرێ •

(٤) واتە لەپاش ڕوودانی کارەساتێك ، ئیتر ترس بۆچی ؟ •

(٥) واتە ئەگەر پلەو پایەیەکی کۆمەلاّیەتیت بوو ، هەوڵ بدە لەدەستت نەچێ ؟ چونکە پلەی‌بەرز ، بەگران دەست ئەکەوێتەوە ، وەئەگەر دەستیشت کەوێتەوە ئەو ڕێزەت نامێنێ •

(٦) چونکە مەرد لێت ئەبوورێ ، نەك نامەرد •

(٧) لەڕووی سوکیەوە ، بەیەکێك ئەووترێ ، کە خۆی زۆر زوو ئامادە بکا بۆ کارێك •

(٨) واتە خوا یارمەتی ئەو کەسانە ئەدا کە خۆیان بۆ کاری پاك‌و ڕەوا ئامادەکەن •

١٥ـ لەجێیەك شینەو لەجێیەك شایی (٩)

١٦ـ لەهەق مەترسە ، ناهەق بەڕێوەیە (١٠)

١٧ـ لەخەڵكی عادەتە ، لەئێمە عیبرەتە (١١)

١٨ـ لەخۆی نادا لەبرای دەدا لەوی وایە لەڕەشكەی گای دەدا (١٢)

١٩ـ لە (دۆرەزە)ی لێیان داوەو لە (باش‌تەپە)ی دەغەزرێ (١٣)

٢٠ـ لەزۆر زۆرو لەكەم كەم (١٤)

٢١ـ لەسەرەوە زەوق ، لەبنەوە تەوق (١٥)

٢٢ـ لەگاكە كلكی بۆ ئێمەیە (١٦)

---

(٩) واتە لەجێیەك خۆشیو شادیو لەجێیەكی تریش شیوەنو ڕۆ ڕۆیــــە •

(١٠) چونكە زۆر جار هەقو ناهەق جێ گۆڕكەیان پێ‌ئەكرێ •

(١١) یەكێك ئەیڵێ ، كەشتێكی ئاسایی لێبكرێ بەنەنگ •

(١٢) بە خۆپەرستێ ئەوترێ ، كە هەست بەئازاری هاوزمانو كەس‌و كارو هاونیشتمانی نەكا •

(١٣) دۆرەزەو باش‌تەپە : دوو گوندن لەپارێزگای هەولێر • بەیەكێك ئەوترێ ، كەلەلایەك دڵی شكابێو لەلایەكی‌تر دەری بڕێ ، یان یەكێ ستەمێكی لێ‌كردبێو بەیەكێكی تری بڕێژێ •

(١٤) هەزارێك وائەڵێ كەشتێكی كەمی بەخشی‌بێ •

(١٥) بەهەموو شتێكی ناشیرین ئـەوتـرێ ، كەبـە بەرگ‌و كالاو ڕووكەشێكی جوان داپۆشرابێ •

(١٦) واتە لەزۆر ، كەممان پێ بڕاوە •

٢٣ـ لەگەڵ شیرا خواردویەتی (١٧)

٢٤ـ لەملەوە لێی هەڵدێ (١٨)

٢٥ـ لەگەڵ کەرا بیەستیەوە ، کەر زەرەزێەتی ! (١٩)

٢٦ـ لەناو چاوا لووت دەردێنێ (٢٠)

٢٧ـ لەناوکوێرا مروش باشقەیە (٢١)

٢٨ـ لەم‌گوێیەوەهات لەویانەوە دەرچوو (٢٢)

٢٩ـ لەنەبوون هیچ‌ناکرێ (٢٣)

٣٠ـ لەوقوڕە ئەوتۆزە هەڵسێ ، هەرباشە (٢٤)

---

(١٧) واتە بەمناڵی فێرکراوە .

(١٨) واتـــە ناشیە .

(١٩) واتە نەزانێ گەوجە .

(٢٠) واتە زۆر دزە .

(٢١) مروش : نیوە کوێرێکی تارمایی بینە . واتە لەچاو کوێرا ئـەم چاو ساغە ، بەنیوە نەزانێك ئەوترێ کە لەناو چەند نەزانێکا خۆی هەڵکێشێ‌و بەزانا خۆی دانێ .

(٢٢) واتە قسەکەی وەرنەگرت .

(٢٣) هەر وەك لەبوون هەمووشتێ ئەکرێ .

(٢٤) بەدەوڵەمەنێکی پیسکە ئەووترێ ، کەیارمەتیەکی کەمی لەدەست بوو بێتەوە بۆ هەژارێك .

٣١ـ لەولای سفرەوە ، سێباز ئەکا (٢٥)

٣٢ـ لەهەوری بەگرمەو لەپیاوی زۆربڵی مەترسە (٢٦)

٣٣ـ لەهەرکۆسێ ، دەرسێ

٣٤ـ لەقنگەوە لەقاوی ئەکا (٢٨)

---

(٢٥) واتە زۆر نەزانە ٠

(٢٦) واتە ئەویان لەوانەیە بارانەکە بیبا بۆ شوێنێکی‌تر ، یان هەر نەیبارێنێ‌و ئەمیشیان هەردەمەو هیچی‌تر ٠

(٢٨) بەیەکێك ئەوترێ ، کەئیشێکی بەرەوەژی‌و ناشی‌یانە بکات ٠( جێی ١٣ پەند پێش خۆیەتی ) لەم پیتە ٠

## پیتی ـ میم ـ

١ ـ ماچێ بۆ گەورە کچێ چی‌یە ؟ !

٢ ـ مار ڕقی لەمارەگیرەبوو ، کەچی لەبەردەم کونەکەیا سەوز ئەبوو

---

(١) بەیەکێك ئەوترێ ، کەکارێکی ناڕەوای کردبێ‌و بەلایەوە گرنگ نەبێ •

(٢) مارەگیرە (کەبەر) ، گیایەکی دڕکاویە ، گەڵایەکی ئەستووری هەیەو بەرێکی درێژکۆلە ئەگرێ کەلەکاتی گەیشتنیا سوورێکی گەشی کراوە ئەبێ •

( بواباوە کە بزن مژە لەکاتی شەڕکردن لەگەڵ ماردا ، تاو ئەداتە ئەم گیایەو لەبەرو گەڵاکەی ئەخوا ) !!

بەیەکێك ئەووترێ ، کەیەکێك ڕقی لێی بێ‌و کەچی لووتی پیا هەڵتەقێ •

٣ ـ مار ، کەدرابەپشتیا ، قەپ بەکلکی خویائەکات (١)
٤ ـ مار ، سەری پان کراوەتەوە ، کلکی ئەجولێ (٢)
٥ ـ ماری ژێرکایە (٣)
٦ ـ ماریش بەقنیات خۆڵئەخوا (٤)
٧ ـ ماڵی پیرێ چێترە لە ماڵی میرێ (٥)
٨ ـ ماڵی شەیتان ئاوا (ئاوەدان) بێ (٦)

---

(١) بەچەند کەسێك یان کۆمەڵێك ئەووترێ ، کەدژمن زۆری بــۆ هێنابن و ئەمانیش بەربووبنە یەکتری •
(٢) بەدژمنێك ئەووترێ ، کە لەبەر دەست لێوەشاندنێکی کوشندە ، لە گیان کەنشتابێ و کەچی هەوڵی هەڵسانەوەو دەست وەشاندن بدا •
(٣) واتە بەدزییەوە ئیشی خۆی ئەکاو دەستی خۆی ئەوەشێنێ •
(٤) دەست پێوەگرتن و کەم خۆری و سامان بەفیڕۆ نەدان ئەگەیەنێ •
(٥) واتە پیاو لەکەسانی هەژارو ئاسایی ، بەهرە مەن ئەبێ ، تاوەکو ئاغاو بەگزادەو دەوڵەمەنەکان •
(٦) ئەگێڕنەوە ، جارێکیان دووپیاو ئەبنە میوانی ماڵێك ، ماڵەکە پیاویان لەماڵەوە نابێ تەنها ژنەکەو کچێکی حەو هەشــت ســاڵەی نــەبێ ، میوانەکان برسی و ئارەزووی چائەبن ، ژنەکــە لەپاش‌خێــراتنی میوانەکان تێ‌ئەگا کە بەدوورەوە هاتوون و ماندووی ڕێگەو برسی و بەئارەزووی چان ، خێرا بە کچەکەی ئەڵێ : چایان بۆ ئامادەکە ، خۆیشی بەنان کردنەوە خەریك‌ئەبێ ، کچەکەیشــ لەباتی ئــەوەی چاکەیان بۆ لێنێ ، کەچی دەست ئەکا بەدەم لارکردنەوە لەمیوانەکان و لاقرتی پێ‌کردنیان و جارێك گوێیان ڕائەکێشێ و جارێك مێزەریان

٩ ـ ماڵ مەزەنەی چاوە (٧)

١٠ـ ماڵە هەڕۆ قورحانخۆر بتخوا (٨)

---

لێ ئەڕووخێنێ‌و پەنجە ئەبا بۆدەم‌و چاویان‌و سواری کۆڵیان ئەبێ ! ! •

ئیتر لەم‌جۆرە پەت‌پەتیانە وا لە میوانەکان ئەکا ، دێنە سەر ئەوەی کەهەڵسن‌و بڕۆن ، وەهەرچەن قسەی خۆشی بۆ ئەکەن‌و بانگی ئەکەنە لای‌خۆیان‌و پارەی بۆدرێژ ئەکەن ! کەڵکی‌نابێ • ئاخری شەیتان ئەچێتە بن کڵێشەی کچەو ( بلامانێ ) بایەکی لێ‌ئەبێتەوە !!

ئیتر دوای ئەم ( ڕووداوە ) یاخوا ڕزگاریی ! هەزار سوێنت بخواردایە ، کەئەوکچە ڕۆیی‌و یەکێکی تری ( عال‌و سال ) هاتەجێی سوێندت نەئەکەوت ، پوختەو پاکیزە هەڵەسێ‌و چایەکی سێ‌کوڵۆیان بۆدەم ئەکاو هەتا پیاڵەکان ئەشوا ، نانیش پێ‌ئەگاو میوانەکان تێروپڕ نان‌و چائەخۆن‌و هەڵەسن ماڵ‌ئاوایی ئەکەن‌و ئەڕۆن •

جا لەڕێگە لەمەیانی خۆیاندا دەست ئەکەن بەپێکەنین‌و ئەمیان بەویان ئەڵێ : ماڵی شەیتان ئاواو ئەویان بەمیان ئەڵێ : کاری شەیتان ڕازبێ •

بەکارێکی خراپ ئەوترێ ، کە بۆ هەندێ کەس ئەنجامێکی باشی‌بێ • وەك وتراوە : شەڕێك بکرێ ، خێری منی تیابێ •

(٧) واتە هەرشتێك کەبتەوێ بیکڕی ، تاچاك لێ‌ی وورد نەبیتەوە ، مەیکڕە •

(٨) واتە هەرماڵێکی دزراو کەسوێندی لەسەرخورا ، بابڕوات •

١١ـ ماڵی کەوتەسەر ، خەمی کەوتەبەر (٩)
١٢ـ ماڵیعەیبدار بۆدۆست ناشێ (١٠)
١٣ـ مانگی قنگ هەڵکلاشە (١١)
١٤ـ مانووحەسانەوەی نیسك ڕنانەوەیە (١٢)
١٥ـ مایەکەو تۆبە (١٣)

---

(٩) بەیەکێك ئەووترێ ، کەتازە ماڵی جیاکردبێتەوەو دەستی کـردبێ بەئیش کردن •

(١٠) واتە هەموو شتێکی خراپ باهەر بۆدژمن بێو شتی باش و بێ لەکەیش بۆ دۆست باشە •

(١١) قنگ‌هەڵ کلاش : قنگ‌هەڵخوراندن • ئەم‌ناوە ، ژنان بەمانـگی کۆتایی زستان ، یان سەرەتای بەهاریان ووتووە؛ چونکە کۆنـە نەماوەو تازەش پێ‌نەگەیشتووە ، واتە زەخیرەی پاشەکەوت کراوی ساڵی‌پێشوو نەماوەو بەرهەمی ماڵاتیش وەك ماست‌و کەرەو پەنیر ، وەگژو گیای بەهاریشـس وەك : قنگرو تـوّڵەو زاخ ( کـاردی ) پێ‌نەگەیبوە ؛ بۆیە کەیبانووی هەژاریش بەرەو موبـەق‌و کوڵێن مەگەر هەر بێت‌و بچێو لاڕانی خۆی هەڵخورێنێ ! •

(١٢) ئەگێڕنەوە ، کەجووتیارێـك چەن‌کرێـکارێکی ئـەبێ ، درەوی گەنمی بۆئەکەن ، لەکاتی پشوودانیـانا پێیان ئـەڵێ : ئـادەی کوڕینە ، بەدەم پشوودانەکەوە ئەو بەرەنیسکەیشم بۆ هەڵگرن !! بەیەاکێکی بێهـووکاوڵ ئەووترێ ، کەتەنهـا چاوی لەقازانجـی خۆی‌بێ •

(١٣) کاسبکارێك ئەیلێ ، کەلەفرۆشتنی شتێکا بەتەمای قازانج نەمابێ ، واتە هەر ئەمجارە زیانم پێ‌نەگا ، جارێکی‌تر ئەم‌کارە ناکەم •

١٦ـ ماین لەعارەب ، ژن لەتیلەکۆ (١٤)
١٧ـ مردن مردنەو تەنیا جارێکە (١٥)
قسە ناکەسان گۆڕەوشارێـکە (١٥)
١٨ـ مردوو ئەمرێ‌و تەنیا جارێکە
تانەی ناحەزان گۆڕە وشارێکە (١٦)
١٩ـ مردوو زۆر دەستی پیاپێنیی لەکاتی شۆردنیا ئەترێ ! (١٧)
٢٠ـ مردن لەڕەگی بناگوێ نزیکترە
٢١ـ مردوویەکی لەخاکدایە (١٩)
٢٢ـ مشتەری کولەباڵە (٢٠)
٢٣ـ مشتێك نموونەی خەرمانێکە (٢١)
٢٤ـ مشك لە ماڵیا کلك سبی ناکا (٢٢)

---

(١٤) تیلەکۆ : تیرەیەکن لەکوردو زۆریان لەکوردستانی ئێرانن • واتە عەرەب بەماین‌و ئەمانیش بەژنی‌باش بەناوبانگن •
(١٥ـ١٦) واتە مرد نەکە باشترە ؛ چونکە یەك‌جارەو ئەبڕێتەوە ، بەڵام هەموو قسەو سەرزەنشت‌و تیرو توانجێـکی خـەڵکی‌و ناحـەزو دژمنان ، تامردن ، مردنێکە •
(١٧) واتە هەموو شتێك سنوورێکی هەیە وە کە لەو سـنوورە دەرچـوو زیانی ئەبێ •
(١٩) بەیەکێك ئەوترێ ، کەلەقسەیەکدا هەڵداتێ‌و بێتەوەلاّم ؛ چونکە پێوەندی‌یەکی بەخۆیەوە هەیە •
(٢٠) واتە خۆی بۆئامادەکردووە •
(٢١) کەم ، نموونەی زۆرە •
(٢٢) واتە زۆرهەژارو برسی‌و ڕەجاڵە ، وەئـەوی ئاردبێ ، یان هـەر خواردەمەنیەکی‌تر ، لەماڵیانیە •

٢٥- مردن ( مەرگ ) براگەورەیە (٢٣)
٢٦- منالّ تانەگری مەمکی نادرێتێ (٢٤)
٢٧- من ئەلّێم : دادە ، تۆبلّێ : کاکە
باخەلّکی بلّێن : چەن‌شیریان پاکە (٢٥)
٢٨- من بەبەرەکی ئەکەم ، ئەو بەپالّوو ئەبێ (٢٦)
٢٩- من ڕازیو تۆ ڕازی ، دارێبە ( ... )ی قازی
٣٠- موو لەدەمی یەکتری ئەبژنن (٢٧)
٣١- مەرگیان دابەسەرچیادا هەلّی نەگرت ، ئادەمیزاد هەلّی‌گرت (٢٨)

---

(٢٣) واتە هەموو کەسێك مل کەچیەتی .

(٢٤) واتە هەموو کەسێك ئەبێ خۆی لەمافی خۆی بپێچێتەوە .

(٢٥) بەڕاستی پێشینانمان نموونەی بەزەییو ڕێزیان پیشـــان داوین ، وەدەست نیشانی دلّپاکیو دلّسۆزی‌یان بۆ کردوین لەمەیانی نێرو مێو گەورەو بچوکدا .

(٢٦) بەرەلّو پالّوو : پەتی جلەگاو مانگاو ماینو کەرو هێسرە . یەکەمیان بەسنگی ولاّخەکەوە ئەبەسترێو جێی پاکترە لەهی دووەم ؛ چونکە دووەمیان بەپاشۆلی وولاّخەکەوەیەو میزو شیاکەی پێوە ئەلکێ ! بەیەکێکی ئەلّێت ، کەتۆ بۆجێی بەرزو چاکی‌بەیو ئەو هەولّی شۆێنی نزمو خراپ بدات .

(٢٧) واتە یەکتریان خۆشەوێ .

(٢٨) واتــە ، یان لەبــەر ئازایــەتیو لێهاتــوویی‌و چاونەترســی‌یەتی ئادەمیزادە ، یان لەبەر سەرسەختی‌و چاو قایمی‌و بێ عاری‌یەتی .

٣٢ـ مەردبەو لەبنەبەردبە
٣٣ـ ماڵان لەتاتان ، بەختان لەفاتان (٣٠)
٣٤ـ مەڕ ، چوارچاوی هەبوو ، دوانیان بۆ شمشاڵ کوێر بووە !؟ (٣١)
٣٥ـ مەلاو مارەکەیە ! (٣٢)

---

(٣٠) تاتان : شوێنی بەردەڵان • فاتان : ناوی ئافرەتە • واتە ئەگەر شوێنەکەت ناخۆش بێ ، بەش و بەختیشت هەرواتەبێ •

(٣١) ئەم پەندە ، ئەوەئەگەیەنێ ، کەوا مەڕو ماڵات و گیان لە بەرانیش ئارەزووی دەنگی شمشاڵ و گۆرانیی و مۆسیقائەکەن ، بۆ نموونە ئەبینین زوربەی شوانەکان شمشاڵ ژەنن و لەکاتی شمشاڵ لێدانا مەڕەکان لێی دوور ناکەونەوە ، یان شوێنی ئەکەون ، هەروەکوو ئەشزانین کەئافرەت گۆرانی بۆمانگا ئەڵێ تائەیدۆشێ •

(٣٢) ئەگێڕنەوە ، کەجارێکیان دێیەك مەلایەك ئەهێنن کەمەلایەتی یان بۆبکات ، وەلەکاتێکا کەخەڵکی دێ کە لەدەوری مەلا کۆ ئەبن و مەلایش حەدیسیان بۆ ئەخوێنێتەوە ، لەولاوە کوڕێکی گەنجی دەم ڕووت و لاسار پەیدا ئەبێ و بەمەلا ئەڵێ :ـ

مەلا ئادەی ( مار ) بنووسە !! مەلایش ئەنووسێ ( مار ) و ئەڵێ : ئەوەمار ، کوڕەکەش ئەڵێ : نەخێر ئەوە مارنیە ! ! سەیرکە منمار ئەنووسم ! پەڕە کاغەزو قەڵەمێك دێنێ و وێنەی مارێك ئەکێشێ و زمانێکی دووفاقی بۆ درێژ ئەکاو ڕووئەکاتە خەڵکەکەو ئەڵێ : توخوا خەڵکینە ئەمەی منئووسیومە لەمار ئەچێ ، یان ئەوەی مەلا ؟؟! •

خەڵکەکەیش هەموو سەیری وێنەی مارەکە ئەکەن و هی

## ٣٦ـ مەنەکەی پێ دۆزی‌یەوە (٣٣)

وایششان ئەبێ لێی ئەسڵەمێتــەوەو هەمــوو بەجارێك ئــەڵێن :ـ وەڵڵاماری‌تۆ تەواوەو مەلا درۆئەکا ! !

مەلایش ڕووئەکاتە کوڕەو پێی ئەڵێ ( کوڕە هەی ئەحمەق ، واقیعەن خۆمن مقصودو نیەتم تصویرو تەشکیلی مار نەبوو ، وانما کیتابەتی ئیسمەکەیەتی‌و فقط لا غیر ) ! .

کوڕەکەش گوێ لەقسەی مەلا ناگرێ‌و ڕووئەکاتە خەڵکەکەو پێیان ئەڵێ : گوێ‌بگرن ، مەلاکەتان چۆن ئەپاڕێتەوە ، تاوەکــو نەخوێندەواری‌یەکەی ئاشکرا نەکەم !

مەلایش ئنجا ڕووئەکاتە خەڵکەکەو پێیان ئەڵێ :ـ

موسلمانینە ! ڕەحمی خواتان لەدڵابێ ، قسەی ئەم هەتیوە منافقە تصدیق مەکەن وەڵڵا وەبیــللا وەتەڵڵا کەزابــە ! خەڵکەکەگوێ نادەنە قسەکەی‌و یەکێ ئەڵێ ، دەزبــڕەو یەکێ ئــەڵێ درۆزنــەو یەکێکی‌تر ئەڵێ : بەخوا من هەر لەحەدیسەکانیشی تێ‌ناگەم !

لەکۆتاییدا مەلای هەزار قاوئەدەن‌و کوڕەکە ئەکەن بە (مەلا)ی خۆیان !

ئینجا مەلایش کتێبە پڕبووتەکانی ئەدابەکۆڵیاو بەبۆڵەبۆڵ لەدێ دەرەچێ .

لەکاتێکا بەکارئەهێنرێ ، کەنەزان جێی زانای گرتبێتەوە .

(٣٣) واتە زۆری لێدا .

(٣٤) ئەگێڕنەوە کەلەکاتی عوسمانیەکاندا کابرایەك ئەچێتە لای والی و پێی ئەڵێ : قوربان هەژارو نەدارام و خێزانێکی زۆرم بەسەرەوەیەو هیچ ئیشێکی گرانیشم بۆناکرێ ؟ بۆیە داواتان لێئەکەم ، کە خەڵاتێکم بدەنێ ، یان ئیشێکی وائاسانم بدەنێ ، کەتیا ماندوو نەبم و دەسمایەیەکی وایشم دەسکەوێ ، کەمناڵەکانمی پێ بژی !
( والی )یش پێی ئەڵێ : برۆ ببە ( باج گر ) لەفلانە شوێن !
کابراش ئەڵێ : قوربان ! باج لەکێ وەرگرم ؟ والیش پێی ئەڵێ هەرکەسێکی پیادە ئەگەر شەل بوو ، یان کەچەڵ یان ناوی (قولی) بوو دوولیرەی مێ سێنە ! ! وەئەگەر کەریشی پێبوو ، بەڵام کەرەکەی دێز بوو ، لەویش هەر دوولیرە وەرگرە !! وەپسولەیەکیشی ئەداتێ؛ تا هیچ ڕێبوارێك نەتوانێت ( لام و جیم ) بکات !
ئینجا کابرا دارێك ئەگرێ بەدەستیەوەو ئەچێتە ئەوشوێنەی کەوالی بۆی دانابوو ڕائەوەستێ ، لەپاش ماوەیەك سەیر ئەکا ، ئەوا کەرسوارێك لەدوورەوە دیارەو هات ، وەکە نزیك ئەبێتەوە ، سەیرئەکا ئەوا کەرەکەیشی دێزە !! لەدڵیخۆیا ئەڵێ : ئەوا خوا گەیاندی ! وەکەئەگاتەلای کابرای باجگر ڕای ئەگرێ پێی ئەڵێ بێزەحمەت دوولیرەمان بدەرێ !! کابراش ئەڵێ : بۆچی ، خێرە ؟ ئەویش ئەڵێ : فەرمانی والی یەو ئەوەش پسوولە ، کابرای ڕێبواریش هەرچەن ئەپارێتەوەو ئەڵێ :ــ
خوا هەڵناگرێ ، منالم ووردە ، بالیرەیەك بێ ، کەڵکی نابێ ، دوو لیرەکەی لێ ئەسێنێ •
ئینجا مێزەرەکەیشی هەڵەگرێ ، ئەبینێ کەچەڵیشە ! ئیتر پێی

٣٨ـ میراتی کەر کورتانیەتی (٣٥)

٣٩ـ من لەبێکەسی ، تۆ لەبەدنەوسی (٣٦)

٤٠ـ میوان خێرۆداوبێ باشە (٣٧)

---

ئەڵێ : ـ خاڵۆ ! خۆ کە چەڵیشی وەڵڵا ئەبێ دوولیرەی تریشمان بدەیتێ ! کابرا ئەڵێ : بۆخاتری خوا کەچەڵنیم ، ئەوەنیشـانەیەو خێزانەکەکەمان هەر هەموو واین دیسان کەڵـکی نابـێ دوولیرەی تریشی لێئەسێنێ !

دیسان کابرای ڕێگر بەکابرای کەرسوار ئەڵێ : ئا بێ زەحمەت ، دابەزەو تۆزێ بڕۆ ، کابراش دێتەخـوارەوەو دووسـێ هـەنگاو ئەڕوا ، باجگرەکە سەیرئەکا : ئەوا تۆزێکیشـس بۆیئەلەنـگێ ! وەئیتر پێی ئەڵێ : ئەوەخۆشەلیشی ! ؟ وەڵـڵا ئـەبێ دوولیرەی شەلینەکەشتمان بدەیتێ !

ئیتر کابرای ڕێبوارئەڵێ : بۆچیخاڵۆ ؟ وەڵڵا ئەمە تۆئەڵێی مەوتی قولیبە ، کابرای ڕێگر ئەڵێ : بۆچی ؟ ناشی ناویشـت قولی بێ ؟ وەڵڵا ئەبێ دوولیرەی ناوەکەشتمان بدەیتێ !!

بەیەکێك ئەوترێ ، یانیەکێ ئەیڵێ ، کە لە هەمـوولایـەکەوە بەدبەختی ڕووی تێکردبێ •

(٣٥) لە ڕووی سووکییەوە ، بەهەژارێك ئەوترێ ، کەمـــردبێو هیچیوای لەشوێن بەجێ نەمابێ •

(٣٦) واتە بۆیە وامان لێهات • ( جێی نۆ پەند پێش خۆیەتی ) لەمبابە•

(٣٧) واتە ئەگەر بووبەمیوانییەکێك ، کەسەریقاڵو جەنجاڵبـووبە ئیشـێکەوە ، ئەوا یارمەتیـەکی بـدەی خراپنیـە ، خۆئەگـەر دیارییەکیشت پێبێ ئەوە باشتریش •

٤١ـ مێش ئەکا بەگامێش (٣٨)

٤٢ـ مێوژە ڕەشە بخوات لەگەردنیا دیارە ! (٣٩)

٤٣ـماینی کەوە لە ( عالان ) بەدی ئەکا (٤٠)

---

(٣٨) واتە ، یان زۆر درۆزنە ، یان هەموو ئیشێکی بچووکیشی بەلاوە گرانە •

(٣٩) بە ئافرەتێکی جوانو بێ لەکەو گەردن سپی ئەووترێ •

(٤٠) بە یەکێکی تەوەزەل ئەوترێ ، کەلەکاتی ئیشدا سەیری جێی دوور بکات •

## پیتی - نوون -

١ - نالێ ( ئالیاوا ) بەرت والەکوێ ٠

٢ - نان بەتەمای چەلاوی خەڵکی لەقاپ مەگوشە ٠

٣ - نان بەهورش خۆشە ٠

٤ - نان کەهاتەڕوو ، نایەوێ خوڵك‌وخوو ٠

٥ - نان ناچێتە سەرەڕێگا ٠

٦ - نان‌و ئیمان ٠

---

(١) واتە سەرلەکەس‌و کار ، یان خەڵکی‌تر نادا ، وەیان ئیش ناکات ٠

(٢) چەلاو : شوربا ، یان‌گۆشتاوە ، واتـە بەهیـوای هیـچ کەسـێك دەست‌مەدە هیچ‌کارێك ، تەنها پشت‌بەخۆت ببەستە ٠

(٣) هورووش : کۆمەڵ ٠ لەگەڵ چەن‌کەسێکا نان‌بخۆی زۆرو بە بڕشت تر ئەخۆی وەك‌لەوەی کەبە تەنهابیت ٠

(٤) واتە شەرم مەکە ٠

(٥) واتە ئەبێ تۆ بەشـوێن بژێوی‌و نان پەیـداکردنا بگەڕێیت نـەك نان بەشوێن تۆدا بگەڕێت ٠

(٦) واتە ئەگەر نان‌بـدەی نان خـوراوبیت ، بـەتایبـەتی بۆهـەژارو لێ‌قەوماوان ، ئەوکاتە خاوەن باوەڕئەبیت‌و خواش لێت خۆشەبێ ٠

٧ ـ نان‌وتوور ، بۆڕێ‌دوور (١)

٨ ـ نان هات بووبە نان‌ودۆ ، نان‌و دۆیش بەخوڵك وخۆ ؟ (٢)

٩ ـ نانی‌جۆ ئەخواو ترِی ئاسن لێ‌ئەدا (٣)

١٠ـ زوێری بڵێ : لەل (٤)

١١ـ ناوێکی گران ، ماڵێکی وێران (٥)

١٢ـ نۆرە نۆرەی (وەلی)یە ، (خەسرەو) پەلە پەلی‌یە ! (٦)

١٣ـ نەبوونی نەبینی (٧)

---

(١) واتە لەکاتی‌برسێتی‌و ڕێی دوورا ، نان‌و توووریش خۆشە •

(٢) کاتێك بەکاری‌ئەهێنی ، کەمیوانێك هاتبێ‌و نانێکی هەرچۆنە وسەرپێ‌یت بۆدانابێ ، واتە نانەکە ئەوە ناهێنێ کەڕووت لێ‌نێم‌و بڵێم زۆرتر بخۆ •

(٣) بەیەکێکی هەژارو نەدارا ئەووترێ ، کەفیزیشی زل‌بێ •

(٤) واتە ناوێرێ دەم بکاتەوەو شتێ‌بڵێ ، یان قسەیەك‌بکا •

(٥) بەیەکێك ئەوترێ ، کەناوبانگێکی گەورەیی ، یان دەولەمەنی‌ی هەبێ‌و وەیتریش هیچ •

(٦) واتە بێ‌وەخت‌و وادە خۆی ئەباتە پێشەوە بۆکارێك •

(٧) نزای‌چاکەیە ؛ چونکە نەبوونی دەردێکی گرانەو هەزار گیرو گرفتی لێ‌ئەبێتەوە •

١٤ـ نەخواردن ، نەکردن ، لەسمێڵان مەیی ! (٨)

١٥ـ نەخەوی گران ، نەچیای گەورە (٩)

١٦ـ نەکەری خوایە ، نەڕایەنی بەنە (١٠)

١٧ـ نە (لات) سەرت بشکێنێ ، نەسەری لات بشکێنە (١١)

١٨ـ نەکار هەیەو نەپیشە هیزە ( خیگە ) ڕۆنەکە بکیشە ! (١٢)

---

(٨) یەکێك ئەیڵێ ، کەئاگای لەکار ، یان ڕووداوێك نەبووبێ‌و بەسەریاندا داسەپاندبێ‌و ساغ‌بووبێتەوە •

(٩) چونکە یەکەمیان لەئیش‌و کار دوات‌ئەخاو لەتەمەنت کەم ئەکاتەوە، دووەمیشیان تاسەری ئەکەوی ماندووت‌ئەکا •

(١٠) ڕایەت : رعیەت ، واتە نەکردەوەیەکی باشی‌هەیە ، کەخواو پێغەمەری لێ قایل‌بن ، وەنە پیاوەتیەکیشی هەیە کەخەڵك لێی بەهرەمەن‌بن •

(١١) لات : هەژارو دەست‌کورتە • واتە هەوڵ‌بدە یارمەتی بدەی ، نەك بچی بەگژیا ، یان وابکەی کەبێت بەگژتا ؛ چونکە لەهەردو حاڵەتەکەدا ، ئەو پوولێکی نیە ، نەبۆ دەواودەرمان نەبۆ دادگاو کرێ‌ڕێ وەهەمووی ئەبێ تۆ خۆتی بۆ ئامادە بکەی‌و براگەورەبی!؛ بۆیە پێویستە بەهیچ شێوەیەکی خراپە توخنی نەکەوی •

(١٢) بەیەکێك ئەووترێ ، کەخۆی بەئیشێکی پڕوپووچەوە خەریك کردبێ •

١٩ـ ئەگبەتێك لەگەرمیانو یەكێك لەكوێستان ،خوا یەكیان ئەخات (١٣)

٢٠ـ ئەما بازی تەرنان ، كوتكە هاتە سەر شوێنێ
دەوڵەت نەمان لەسەران ، مامەڵە كەوتە سەرقوڕنێ (١٤)

٢١ـ نیشانەی باران بایە نیشانەی مردن تایە (١٥)

٢٢ـ نیوەی دنیا بەبوختان ئەسووتێ (١٦)

---

(١٣) لەكاتێكا بەكارئەهێنرێ ، كە دووكەسی نالەبار گیرابنە یەكتری •

(١٤) لەكاتێكا بەكارئەهێنرێ ، كە نەزان جێی زانای گرتبێتەوە

(١٥) واتە هەموو شتێك نیشانەیەكی هەیە •

(١٦) واتە زۆركەس بەدرۆو دەلەسە ، گرفتارو ماڵوێران ئەبن •

## پیتی – واو –

١ – واوی ( وەحا ) لەدەمیانیە
٢ – ووتیان : ( بالە ) دات ئەنێن • ووتی : دائەنیشم !
٣ – ووتیان : ( ڕەحیمەقەل ) ووریابە لووتیشت نەبڕن !
ووتی : حەددیان چیە ؟!
٤ – ووتیان : کەڵەشێر بارە ! ووتی : باریش بێ من هەر سەربارم •
٥ – ووتی : باوکی قسەخوانم ڕۆ ! ووتیان : کەس بەگوێی ئەکرد ؟
٦ – ووتی : چارەی دەردت ئەکەم ، ووتی : کەی ؟

---

(١) بەیەکێکی نەخوێندەوارو بەسەزمان ئەوترێ ، کەلەبەرو دوای کارێك نەزانێ کەلەباتی بڵێ : وەحا ، ئەڵێ : حا •

(٢) بالە : کورتکراوی ( بارام ، یان باڵوڵ ) ە • دات ئەنێن : لەشوانیت ئەخەن • دائەنیشم : خۆمنایکەم • بەیەکێك ئەوترێ ، کەئیشێکی نەدەنێو بڵێ خۆمنایکەم !

(٣) کابرایەکی (ڕەحیم) ناو ئەبێت ، بەهۆی دەم نەوەستاوی‌و زۆربڵێی خۆیەوە گوێی ئەبڕن ! بەڵام دوای ئەوەش هەر لەدەمی خۆی ناکەوێ‌و لەسەر ئەو بابەتە ئەدوێ کەگوێیان لەسەری بڕیوە ، وەکەخەڵك‌و خوا پێی ئەڵێن وامەبە ، بالووتیشت نەبڕن ، ئەویش ئەڵێ : حەدیان چیە ! ؟

بەیەکێك ئەوترێ کەبێ لەبەهێزی دوژمن‌و نەنگی خۆی نەنێ •

(٤) واتە بێ باکەو هیچ بەرپرسیاری یەکی لەسەرنیە •

ووتی : لەوەودنیا ! (١)

٧ ـ ووتی : ڕۆڵە ئەت فرۆشم ! ووتی بابە چۆن دڵت دێ ؟
ووتی : بەنرخێکت ئەدەم کەس نەت کڕێ ! (٢)

٨ ـ ووتی : قوزڵقورت ! ووتی : بەڕۆنەوە ؟! (٣)

٩ ـ ووتی : مەرحەبا ! ووتی : جل پینە ئەکەم ! (٤)

١٠ـ ووتی : نەخۆش ؟ ووتی : مەم دوێنە ! ووتی : هیچ ئەخۆی ؟ ووتی : بۆم بێنە ! (٥)

١١ـ ووتی : هیچمان نیە بیخۆین ! ووتی : دوو سەڵك پەنیر ! (٦)

١٢ـ وورگی تێرم ئەسپی ژێرم (٧)

١٣ـ وەرزێری ئەمساڵ بۆساڵێکی‌تر ئەگیرێ (٨)

---

(١) بەشتێك ئەوترێ ، کەزۆر درەنگ بێتە ئەنجام .
(٢) بەیەکێك ئەوترێ کەبیانووی گەورەبگرێ لەفرۆشتنی شتێکا .
(٣) بەبێعارو نەوسنێك ئەوترێ ، کەهەر ئەوەنە ملچەدەمەیەکی بدەیتێ ، ئیتر جۆرەها پەت‌پەتی قبوڵ بکات .
(٤) بەیەکێك ئەوترێ ، کەلەقسە ، یان بابەتێك تێنەگاو وەلامێکی پیچەوانەی بداتەوە .
(٥) بەیەکێك ئەوترێ ، کەبەدرۆ خۆی نەخۆش خستبێ .
(٦) واتە دەوڵەمەن‌و تێر ، ئاگایان لەهەژارو برسی‌نیە .
(٧) واتە تێری سەری هەموویەنی .
(٨) واتە هەموو ئیشێك ئەبێ پێش‌وەخت خۆی بۆئامادە بکەی .

١٤- وەك ئاش دانەڕێز ئەكا (٩)
١٥- وەك بەگا نەبووی ، بەگوێرەکەش نەبووی ؟ (١٠)
١٦- وەك بۆق وایە ، هەڵی گری میزتپیا ئەکا ! (١١)
١٧- وەك بێناوئاو ئەلەرزێ (١٢)
١٨- وەك پشیلەوایە ، هەرگیز پشتی ناکەوێتە زەوی (١٣)
١٩- وەك تالأنی دەمی ملەیە (١٤)
٢٠- وەك قاپی دەمی سەگ وایە (١٥)
٢١- وەك کوچکا تلاکورو وایە ! (١٦)

---

**(٩)** دانەڕێزکردن : مەبەس لاکەوتن و بازرەقە بەستنی دنکەکەنم ، یان هەردانەو یڵەیەکی ترە ، کە لەئاشی ئاو ئـەهاڕرا ، بەجـۆرێ کـە لەگەری ئاشەکەوە بکەوێتە سەر بەرداشەکەو تێکەڵی ئاردەکەبێ • بەیەکێك ئەووترێ ، کەقسەی تێکەڵو پێکەڵو بێ کەڵك بکات •

**(١٠)** لەرووی گاڵتەپێکردنەوە ، بەیەکێکی ئـەڵێت ، کەچـاوەڕوانی پیشەو پلەیەکی لێکرابێ و هێشتا هیچی دیارنەبێ •

**(١١)** بەسپڵەو بێنەزانێك ئەوترێ ، کەتۆچاکەی لەگەڵ بکەی و بەخراپە پاداشت بداتەوە •

**(١٢)** بەیەکێك ئەوترێ کەلەترسا ، یان لەسەرما بلەرزێ •

**(١٣)** بەزۆرزان و فێڵبـازو کارکردەیـەك ئەوتـرێ ، کەهـیچ جارێـك نەیدۆڕێنێ •

**(١٤)** بەشتێك ئەوترێ ، کەلەتیاچوونابێت و لەدەمی دژمن دەرت هێنابێ •

**(١٥)** بەشتێك ئەوترێ ، کەپیس و چەپەڵ دەمیان تێژەندبێ •

**(١٦)** کوچکا : دیوەخان تلاکۆرۆ : گوندە •

٢٢- وەك گاوانەکەی ( بیرەبات ) ی لێهاتووە ! (١٧)

٢٣- وەك مار وایە مەکانیبۆنیە (١٨)

٢٤- وەك نوێژی قەزا پێی گێڕایەوە (١٩)

٢٥- وەی لەوڕێ نزیکەو قازانجەزۆرەی ! (٢٠)

---

(١٧) بیرەبات : گوندێکە لەپارێزگای هەولێر •

(١٨) بەیەکێك ئەوترێ ، کەزۆر بگەڕێ •

(١٩) بەیەکێك ئەوترێ ، کەهەقێکی لای یەکێك بووبێو زۆرچاك لێی سەندبێتەوە •

(٢٠) ئەگێڕنـەوە ، کەجارێکیان پشـیلەیەك ئەچێتـە پارێزی مشـکێك ( ئاشکرایە ؛ بۆئەوەی کەبیخوات ) بەڵام مشکەکە تۆزێ سـەری خۆی دێنێتە دەرەوە لەکونەکەی ، خێرا پشیلەکە بەدی ئەکاو خۆی ئەکاتەوە بەکونەکەیا ، وەلەپاش ماوەیـەکیتر دیسان سـەرێکیتر دەرئەهێنێتـەوە ، ئەبینێ پشیلەکە هەرخـۆی مەڵاسداوەو چاوی تێبڕیوە ، ئینجا بەتەواوەتی تێئـەگا ، کەمەسەلەچییە لەنـاو کونەکەیدا ڕائەوەستێو هەر زەق زەق سەیری پشیلەکە ئەکات • ئیتر پشیلەکە تێ ئەگا کە مشکە بەئاسانی نایەتـە دەرەوە ، پـێی ئەڵێ :- لەوکونەی خۆت وەرە دەرەوە بۆ ئەم کونەی ئەم لای من، عەلبەیەك ( ١٦ تەنەکە )برنجی پاكی باکراوت ئەدەمێ !!

مشکەکەش بیر ئەکاتەوەو ئەڵێ : ڕێیەکی وانزیكو قازانجێکی وا زۆر بێ دەردی سەرینیە • ئیستە بەیەکێ ئەوترێ کەپارەیەکی زۆرو لێشاوی بۆ دیـاری کـرابێ لەپێناوی شتێـکی کەم ، بەڵام بەوەیشووە •

## پیتی ـ هێ ـ

١ ـ هانام وەدەمت •

٢ ـ هاوڕێی خراپ وەك قەلەڕەشە •

٣ ـ هایی تووریەنی ( هایی توورئەکا ) •

٤ ـ هڕی لەبڕی ناکاتەوە •

٥ ـ هلێل دێت ، بلێل ئەبات •

---

(١) واتە یاخوا وابێ وەك تۆ ئەڵێیت •

(٢) واتە بێجگە لەوەی کەبێ کەڵکە ، زیانیشت پێ ئەگەیەنێ •

(٣) بەیەکێك ئەوترێ ، کەکچێکی هەبێو داواکاری نەبێ ، وە هەمیشە باسی ژنو ژنخوازی بکات •

(٤) هڕوبڕ : دوو وشەی پێچەوانەی یەکترن • یەکەمیان بـۆ بانگ‌و خوڵك کردنی مەڕی خۆیی‌و دووەمیشیان بۆ جیا کردنەوەو دوور خستنەوەو تاراندنی هی نامۆو ئاوەکی بەکار ئەهێنرێ ، کەئەمەش پیشەی شـوانو خاوەن مەڕەکانـە کەپێویسـتە زۆر سەرنـاسو پسپۆڕبن لەم بابەتەوە ، بەیەکێك ئەوترێ ، کەچاكو خراپ ، یان خزمو بێگانە لێك نەکاتەوە •

(٥) بەخانوو بەرەیەکی کونو کە لەبەراوی ئەوترێ ، کەهیچی پێوە نەوەستێ •

٦ ـ هەتیو ، فێری مەکە ، کەفێرت کرد تیری مەکە ... (١)

٧ ـ هەرپەلێکی بەدەست ئیزرائیلێکەوەیە (٢)

٨ ـ هەرچی بەتەڕی خواردی ، بەوشکی دانایەوە (٣)

٩ ـ هەرخۆڵ لەچاو مردوو ئەکرێ (٤)

١٠ـ هەردووبێی کردە کلاشێ (٥)

١١ـ هەرزان بایی بێ ، بێ مەلامەت نابێ (٦)

١٢ـ هەرزە وەخەیاڵ وەماڵ نەمەبۆ شەوگاری زستان وەساڵ نەمەبۆ (٧)

---

(١) چونکە تیرێ کەی وازناهێنێ .

(٢) واتە ئیشی زۆرەو سەری جەنجاڵەو خەڵك دەمیان تێ ژەندوە .

(٣) بەیەکێك ئەوترێ گوزەرانێکی باشەوە ، کەوتبێتە ناخۆشی یەکیەوە ، کەتۆلەی لێ کرابێتەوە .

(٤) بەمردوویەك ئەوترێ ، کەچەن کەسێك بەکەلەپوورەکەی بەختەوەر بووبن .

(٥) بەیەکێك ئەوترێ ، کەیەکێکی هەڵ پێچابێ بۆقەرز لێ وەرگرتنەوەیەك ، بەجۆرێك کەجێی پێ شلوق کردبێ .

(٦) واتە هیچ شتێکی هەرزان مەکڕە ؛ چونکە بێ کەمو کورتی نیە .

(٧) هەرزە : مەبەس نەزانە . واتە خولیاو ئەندێشەی بێ هەوڵ وکۆشش کەس دەوڵەمەن ناکات ، وەئەگەر تێکۆشان هەبێ ناخۆشی و دەست کورتی درێژە ناکێشێ .

١٣ـ هەرزەرەری بۆمەرەکان نەبێ ئیتر قەی‌ناکات (٨)
١٤ـ هەرسکێ بەهارێکە (٩)
١٥ـ هەرشەرێك بۆجوامێرێك (١٠)
١٦ـ هەرکەزی زەردێ سمێل سوورێکی هەیە (١١)
١٧ـ هەرکەس دەس‌بۆدەمی‌خۆی ئەبا (١٢)
١٨ـ هەرکەس گای‌دۆڵێك ئەڕانێ (١٣)
١٩ـ هەرکەس ماڵی‌نەبێ ، خۆیشی‌نەبێ (١٤)

---

(٨) ئەگێڕنەوە ، کە کابرایەکی خێڵەکی شوانێکی ئەبێ ، ڕۆژێکیان ئەبینێ کەشوانەکە نوێژئەکا ، ئەمیش زۆری بەلاوە سەیر ئەبێ ! لێی ئەپرسێ : ئـەرێ بـرا ، ئەو قـنـگەقوبچەیـە چی‌بـوو ؟؟! شوانەکەش ئەڵێ : نوێژبوو • کابراش ئیتر ئەم قسەیە ئەکا ، واتە هەر کارێك ئەگەر بۆکۆڕو کۆمەڵو گەل‌و نیشتمان زیانی نەبـێ قەیناکا •

(٩) برسی‌یەك ئەیلێ ، کەتێری خواردبێ •

(١٠) کاتێك ئەوترێ ، کەیەکێك نیشانەیەکی لێ‌هاتوویی دەرخات •

(١١) کەزی : پەلك • واتەکەس بێ‌کەس‌نیە ، یان هیچ ئافرەتێك بێ دالدەنیە •

(١٢) واتە کەس خوێ ناکاتە زامی‌کەس •

(١٣) ئەڕانێ : لێی ئەخوڕێ ، داژوا • بەچەن کەسێك ، یان گەلێك ئەوترێ، کەهەر کەس بەئارەزووی خۆی ئیش بکاو، ئیشی‌بێ‌سەرو بن بکرێ •

(١٤) چونکە هەرکەس‌ماڵو سامانێکی نەبێ ، خەڵکیش سووكو بێ‌نرخ سەیری ئەکەن •

٢٠ـ هەرمەردێ بەردێ (١٥)

٢١ـ هەرگاڵتەیە ، بووەبەڕاست (١٦)

٢٢ـ هەرگیز خەمەخۆ ، خەمزایەی سەرە بەهار تاپایز خوادەروو کەرە (١٧)

٢٣ـ هەر مێزەردار ئەچێ بۆلای لەچەکدار (١٨)

٢٤ـ هەر هەوەسێ بۆ نەفەسێ هەر گەوادێ بۆتەرەسێ (١٩)

٢٥ـ هەژاری ژەنگی مێرانە (٢٠)

---

(١٥) واتە ، هەر کارێ ، کەهەریەکە لەلایەکەوە دەستی بدەنێ ، زوو ئەنجام دێ •

(١٦) واتە هەندێ جاریش قسەی جەرگ‌بڕ ، بەپێکەنینەوە ئەکرێ •

(١٧) واتە هەندی جاریش خەم‌و پەژارە ئەبێتە هۆی سەرگەردانی‌و ماڵ کاولی ئادەمیزاد ؛ بۆیە پێویستە تا ئەتوانین خۆمان لەخەم‌و پەژارە دوور خەینەوە ( شاعیر ) ووتوویەتی :ـ
هیچ خەفەت مەخۆ ، شت کە لەدەست چوو
عومریشت ئەڕواو خەم ئەبێ بەدوو •

(١٨) واتە ئەبێ پیاو سەر بدا لە ئافرەتی خزم‌و ناسیاوی خۆی •

(١٩) واتە زۆر کەس بەهۆی یەکێکەوە ئەکەونە خۆشی وەزۆر پیسیش بەپیسییەوە ئەڕوا ( ئەوکەسەی ئەم پەندەم لێ‌بیستووتی ، لەفارسیەوە وەرگیراوە ، منیش ئەڵێم لەشیعری شاعیرانمانەوە نزیکترە ) • بیورن •

(٢٠) واتە نەبوونی زۆر جار ئادەمیزاد نەنگدارو شەرمەزار ئەکا •

٢٦ـ هەژدە لە نیسانێ گیشە لەعەردی کولۆ لەعاسمانێ (٢١)
٢٧ـ هەقە هەقدارم ، بەشە بەشدارم (٢٢)
٢٨ـ هەڵ مەپەڕە بەر لەوەی ماڵی زاوابزانی (٢٣)
٢٩ـ هەڵوڕ ( هەلبڕ ) نە وەشێنە (٢٤)
٣٠ـ هەموو دنیا تاریکی شەو بێ ، ناتوانێ ڕووناکی مۆمێك بکوژێنێتەوە(٢٥)
٣١ـ هەموو شتێ بەرێیوادە ئەوەستێ ، وادە بەرێی هیچ ناوەستێ(٢٦)
٣٢ـ هەموو شتێك لەباریکی ئەپچڕێ ، زلم لەقایمی (٢٧)

---

(٢١) گیشە : گەلاوێژ ، یان شارای جۆیە • عەردی : زەوی کولۆ : کەللە • واتە لەو ڕۆژەدا ئەوشتانە ئەبن •
(٢٢) واتە هەر چۆنێك بێ ئەوشتەم هەر ئەوێ •
(٢٣) واتە لەهیچ کردارو ووتارێکتا ، بەر لەوەی کەلێی تێبگەی ، لەخۆتەوە هەڵ مەدەرێو پەلەمەکە ؛ تاهەموو شتێکت بۆ ڕوون ئەبێتەوە ، ئینجا بەئەسپایی‌و ووردە ووردە تێی هەڵچۆ •
(٢٤) بەیەکێك ئەوترێ ، کەهەڕەشەو گوڕەشەیەکی زۆربکاو دەستیش نەوەشێنێ •
(٢٥) چونکە ڕووناکی لەتاریکیداو ڕاستی‌و دادپەروەری لەنادادیـــا هەمیشە دیارو گەشاوەو خۆشەویستن •
(٢٦) واتە هەموو شتێ لەوەختی خۆیا ئەبێ بکرێ •
(٢٧) واتە هەر کاتێ ستەم‌و جەورو زۆر پەرەی سەندو زیاتر دەستی ناپاکی‌ی خۆی وەشاند ، ئەوکاتە لەناو ئەبرێ ؛ چونکە خەڵکی ستەملێ‌کراو لەمافی خۆیان خۆش نابن •

٣٣ـ هەموو گوێزێك خڕە ، بەڵام هەموو خڕێك گوێزنیە (٢٨)

٣٤ـ هەنگاوێك بۆپێشەوە ، دوو هەنگاو بۆدواوە (٢٩)

٣٥ـ هەنگ‌دۆزو کەزسۆزو خایەکوت ئیمان دەرنابەن (٣٠)

---

(٢٨) واتە دیمەن پەرست مەبە •

(٢٩) بەشتێك ئەووترێ ، کەبەڕواڵەت بۆ پێشەوە بێت ، بەڵام لەراستیدا وا نەبێ‌و بەپێچەوانەوە •

(٣٠) هەنگ دۆز : ئـەو کەسـانەن ، کەبەشوێـن هەنـگی کێوی ئەگەڕێن ، کەلەقڵیشە بەردو کلۆری‌دارانداشانـی هەنـگوینیان داناوە ، بە جۆرێك کە ئاگرو دووکـەڵیان ئـەدەن ؛ بۆپەرەوازە کردنی هەنگەکان ؛ تاشانی هەنگوینەکەیان ببڕن ، ئەمەش بێ‌گومان ئەبێتە هۆی یانەتێکدان‌و لەناوچوونی هەنگەکان ، بێجـگە لـەوەی کەزیانێکی زۆریش لە ئابووری وولات ئەدا • کەزسۆز : ئەوانەن کەشاخ‌و بنارو پێ دەشتەکان ئەسوتێنن بۆمەبەستێکی تایبەتی خۆیان، کە ئەمەش ئەبێ بەهۆی برسی کردنی ماڵاتی بەسەزمان‌و زیانێـکی گەورەیە بۆ سامـانی ئاژەڵـی ، کە بەشێـکی گەورەیە لەئابووری وولات •

خایەکوت : گون کوت ( خصـاص )ە ، ئەوانەن کەوا گونـی نێرەی ماڵات وەك گیسك ، چتر ، کاوڕ ، شەك‌و نۆبەن دەرەهێنن ، یان ئەیکوتنەوەو ئەیبەستن ؛ تائەندامی ( زاوزێ کردنیان ) بمرێ‌و نەپەڕن‌و بەقەڵەوی بمێننەوە ؛ بۆ ئەوەی پارەی زۆریان بۆبکات •

٣٦- هەنگوینەو لەپێستی سەگدایە (٣١)

٣٧- هەنگوینێکی بێمێشە (٣٢)

٣٨- هەوێیەکی هەیە ( کالێ )ی ناوە (٣٣)

٣٩- هەوەڵدەست هی کافرانە (٣٤)

٤٠- هێشتا وەڵەدی نەبووی بەجەیران تا لەدەشتەو دەر تێربکەی سەیران (٣٥)

٤١- هێشتا قەل دەنووکی نەداوە بە ( گ .. )دا (٣٦)

---

(٣١) بەهەموو شتێکی باش‌و بەکەڵک ئەووترێ ، کەلەژێر دەست یەکێکی خراپ‌و قیرسچمابێ .

(٣٢) واتە ماڵێکی مفتە ، بەشتێکی زۆرو بێ‌سەرگیرو بەرگیر ئەوترێ، کە خەڵك تێی مرۆشابن .

(٣٣) بەیەکێك ئەوترێ ، کەهەموو باس‌و خواسێکی بباتەوە سەر ئەوکەسەی کەڕقی لێیەتی .

(٣٤) یەکێك ئەیڵێ ، کەدەستێکی لێوەشابێ‌و بیەوێ تۆڵەی خۆی بکاتەوە .

(٣٥) وەڵەد (کاراسك)ە . جەیران : ئاسك ( مامز ) . واتە هێشتا مناڵی‌و نەکەیشتوویتە ئەوڕادەی کە تاڵ‌و سوێری ژیانت چەشتبێ .

(٣٦) بەیەکێکی ئەڵێت ، کە قەرزێکی لات‌بێ‌و بەیانیەکی زوو هاتبێتە سەرت بۆ داوا کردنەوەی .

٤٢ـ هەقە هەقدارم ، زۆرە زۆردارم (٣٧)

٤٣ـ هەتا گمێزی کە فەگرێ ، عێل بارەکا (٣٨)

---

(٣٧) واتە بە زۆربێ‌و بەخوایشت ئەم شتەم هەرئەوێ • ( جێ‌ی دوای پەندی ٢٧ )ە لەم بابە •

(٣٨) بەدرەنگ ئاخێرو تەپ ڕەوێك ئەووترێ ، کەدرەنگ بکەوێتــــە خۆی بۆ کارێك • (جێ‌ی دوای پەندی پێنجەمە ) لەم بابە •

# پیتی - یێ -

١ ـ یان‌بەهیمەت ، یان‌بەقیمەت
٢ ـ یان کۆڵ‌یەنێ ، یان زۆڵ
٣ ـ یانزە ئەکەمەشانم ، سیانزە ئەنێمە گیرفانم
٤ ـ یەك کەزیلە نیەو دووکەزیلەشی ناوێ
٥ ـ یەك‌وبڕ ، قۆدی‌بڕ
٦ ـ یەك‌و دووی لێ‌نەکرد

---

(١) بۆ داوا کردن بەکار ئەهێنرێ ، واتە چ بەپێشکەشی چ بە خەلات بێ ، بمدەرێ •
(٢) واتە یان سوودو قازانجێکی باشی دەست ئەکەوێ ، یان سووك‌و ترۆ ئەبێ •
(٣) یانگزە : تفەنگی یازدە تیری ئینگلیزی‌یە •
سیانگزە : مەبەس سیازدە دیناری موچەی پۆلیس‌و کەسانی‌ترە •
یەکێك ووتوویەتی ، هەر مەبەستی پارەبووبێ‌و هیچی‌تر •
(٤) واتە ئافرەتی باشی دەست ناکەوێ ؟ بۆ خواستن‌و هی خراپیشی ناوێ •
(٥) قۆدی : قوتوو • پارمەتی‌دان ئەگەیەنێ •

٧ ـ یەکێك ماڵی سووتابوو ، کەچی یەکێکی تر دەستەوانە ئاگری لێ ئەبرد(١)

٨ ـ یەکێ کەمە ، دووخەمە ، سێ سەرجەمە (٢)

٩ ـ یەك لە مردن بوو یەك لەتێوە کردن بوو (٣)

---

(١) بەیەکێك ئەوترێ ، کە هاوبەشی ئێش و ئازاری خەڵکی نەکاو ، تەنها خۆی مەبەست بێ ، بەجۆرێك ، کە کەڵك و پێویستی خۆی لەزیان و لێ قەومانی ئەوان دەرکات .

(٢) سەیری پەندی ( سێ مینە حەدیسە ) بکە .

(٣) سەیری ڕافەی پەندی ( یەکێ ماڵی سووتابوو ... ) بکە .

# تـــكا :ـ

خوێنەری ئازیزم ، باوەڕناکەم کەسی وا هەبێ ، کە هەموو مەرجێکی بێ لە کەیی‌تیابێ بەتایبەتی لەزمانەوانیۆ ئەدەب ؛ بۆیە کاتێ کە ئەم کتێبە دەخوێنیتەوە ، بێ‌گومان لەم جۆرە هەڵاتەت بەرچـاو ئـەکەوێ ، تـکام چاوپۆشی کردنەلێ‌یان ؛ چونکە وەکو لەسەرەتاوە ووتم لەم ڕووەوە هیچ دەستێکم تا ئێستە نەبووە ! وەهەر وەکووووتیشم پێویستی بەیارمەتی دانی زۆر لایەن هەیە ، وە بێ گومان وەکو ئەشزانن کەوا سەرچاوەی کوردی لەم بابەتەوە زۆر زۆرکەمە ،وە ئەوەشی کە هەیە ، بەناشکوری ناڵێم ، دەست هەموو کەس ناکەوێ ، وە وەکو ئاشکرایشەکە : ڕەخنـە هـۆی خاوێن کردنەوەیە لە هەڵەو کەمۆ کوڕی ، وە وەکو پێشینانیشمان ووتویانە :

دیاری شوان یاشەنگە ، یاهەڵەکۆك ، ئیتر سوپاس •

## فەرهەنگۆکی ئەم کتێبە : ـ

مۆچیاری : ئامۆژگاری

ئەمەك : وەفـا

نەوە ، وەچ : ڕۆڵەی دواڕۆژ •

ئەوجا : ئەوسا ، ئەوکاتە •

بوی : بـوو

هاتۆ : هاتەوە

پۆخلە : ناپوختە ، پیس

قایل : ڕازی

خاس : چاك ، باش

گەنج : زەخیرە ، بەرهەم

گەنجینە : نەختینە ، پاشەکەوت

خەلە : گەنمو جۆ

ئار : ئاگر ، ئاور

کایەن : کادان

چەنگ : چنگ ، مشت ، گوێل

زەنگار : سنجار ــ ناوچەیەکە

لە پارێزگای نەینەوا ــ موسڵ

وەسپ : وەسف

لار : خوار ، چەوت

سەندن : کڕین ، وەرگرتن

بێشك : بێشکە ، لانکە

بێ : ببێ ، یان : وەرە

تێ : دێت ، یەت

چاووش : لۆتی

بوونەوەر : کائنات

مێلاك : ( تام کردن ) چەشتن خواردن

دەستی ناپەرژێ : دەستی ناگات ، ماوەی نیە

قاچ : لاق ، ڕان

کوڵ : کورت

تەما : تەماع ، قرم لێخۆش کردن

جوێن : جنێو ، جون ، جمێن

بەورە ڕۆژ : ئەورۆژەی کە بەفر
بباریٚ ، یان لەزەوی دابیٚ
پووکاوڵ : ویژدان

× × ×

## بۆ نووسینی ئەم بابەتە کەڵك لەمسەر چاوانە وەرگیراوە : ـ

١ـ پەندی پێشینان شیخ محمدی خاڵ .

٢ـ ئەدەبی فۆلکلـۆری کوردی لێکۆلینــەوە د . عیززەدین موستەفا رەســول .

# ســــوپاس

- زۆر سوپاسی ئەم مامۆستاو برایانە ئەکەم کە بۆ بەرهەم هێنانی ئەم کتێبە یارمەتیان‌دام :ـ

- مامۆستا عمر شیخ اللەدە شتەکی کە هانی‌دام بۆ بلاوکردنەوەی •

- بەرێزان کاك حسن محمد عمر و کاك شعبان فەرمانبەر لەدەستەی گشتی کشتوکاڵو چاك کردنی کشتوکاڵی هەولێر •

وە هەموو برادەرانی بەشی هەرەوەزی کشتوکاڵ لەهەولێر •

- بەرێزان کاك صالـح احمـــدو کاك عمر حمـــە قانــع فەرمانبەرانی دەستەی کشتو کاڵی سلێمانی •

- کاك جمال محمد امین چاودێری بەشەکانی ناو خۆیی زانـکۆی سلێمانی •

## نووســـەری ئەم کتێبــە

ناوم ( عەلی مەعروف محمد )ە و لە ساڵی ١٩٤٥ لە شارە زوور لە دایك بووم و قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و دوا ناوەندیم لەسەید صــادق و هەڵەبجــەو سلێمانی تــەواو کردوەو ئێستەش لە دەستەی کشتوکاڵی سلێمانی فەرمانبەرم •

**نرخي (٧٥٠) فلسه**